# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١٥

( ئـــاب )ی ٢٠٠٦

**گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات**




- رێگایەك بـۆ قفڵ دانی پـۆرتەکانی کۆمپیوتەرەکەت
- وەرگێڕانی فـایلی جـۆری DVD بۆ VCD ڤیدیۆ سیدی
- خـودی نابینا لەگەڵ ئـامێری سـەردەم
- چۆن ڤـایرۆسەکانی ناو وێنە دەدۆزیتەوە
- زاراوەکانی مۆبایل



# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە 15

ئابی ـ 2006

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات


خاوەنی ئیمتیاز
وەزیری رۆشنبیری

سەرنووسەر
ئاراز مەولود رەشید

بەڕێوەبەری نووسین
فاخر مەحمود میرزا

بەڕێوەبەری هونەری
سالم بابە شیخ

دەستەی نووسەران
ڕێناز ئەردەڵان بەکر
کاوە سلیمان
شاخەوان عمر حسن

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

سەرپەرشتی چاپ
ئەهرۆ مەحمود


تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


ناونیشان :
هەرێمی کوردستان/ عێراق ـ هەولێر . بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی بەحیا نهۆمی دووەم شوێنی مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس ی کۆن بۆ هەر پێشنیار و سەرنجێك یان ناردنی بابەتێك .پەیوەندی بکەن بەسەرنووسەرەوە بەم ناو نیشانە . :
دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری ـ بەڕێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر ـ یان ناونیشانی سەرەوە .
یان بە ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی گۆڤار : 2527054 یان مۆبایلی سەرنووسەر 07504618045

یان پۆستی ئەلکترۆنی :

E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com
aras_co_center@yahoo.com




ئاگاداری:

بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ بڵاو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بەتەواوی ئاماژە بکەن بە ناونیشان وسەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن وهەروەها دەبێ رەچاوی ڕێسای نووسین

# پێرست

## ناوەڕۆکی CD ژمارە ١٥ 3

## ڕیپۆرتـــاژ 43



## بەرنامـــــە 5



## ئەنتـــەرنێت 46



## هەمەڕەنـــگ 57



## زانیـــاری 30

# ئەو بەرنامانەی کە لە ناو سیدی ژمارە ١٥ دا هەیە

ئا : هێرش ئسماعیل

## بەشی ANTIVIRUSE






- Kaspersky Anti-Virus Personal
- McAfee VirusScan 2005 Pro v9.0
- PC-cillin Internet Security 2005
- Zone Alarm 5.5.62.0

## بەشی Internet





- BPS Spyware and Adware Remover v8.2.0.7
- Download Accelerator Plus v7.4
- Download Studio v1.0.0.7
- FlashGet 1.65
- httport3snf
- LanTalkPro v2.6.1.2 Multilanguage
- Mass Downloader 3.0
- Mozilla Firefox 1.0
- MSN Messenger v7.0.0425 Arabic
- MSN Messenger v7.0.0425 English
- MyProxy 6.33
- Opera 8
- Speed4web v1.1
- Yahoo! Messenger 6.0.0.1921

## بەشی Flash tools





- 3D Flash Animator 4
- Dream FlashSee 1.1
- Flash Slider v1.3
- Geovid Flash to Video Encoder 2.1
- Goldshell FlaX 3.01
- Magic Swf2Avi v2.01
- Mix FX v1.4
- Install Flash Player 7.exe
- Sparkle SWF Desktop 1.0
- Swift 3D 4.0
- Swish MAX 2004
- Swish Studio 1.5
- Text Orston 1.03
- Zealot SWF2Video Studio v1.3.1
- Install Flash Player 7 AX.exe

## بەشی Graphics






- 3D Canvas 5.7a
- Alteros 3D 2.1
- Effect3D Studio 1.1.3
- MegaView New
- Photo Brush V 1.8
- Photoshop Tools
- PICASA v1.5
- Ulead GIF Animator 5.0
- Xara3D 6.0 Xtra Plus

- SideBar
- SpeederXP v1.60
- Stardock Essorant Skin Pack for WindowBlind
- WinAce v2.6 beta 1
- WinRar v3.42
- WinZip 9.0 SR-1

## بەشی Multimedia




- All Audio Converter V1.50
- AV Voice Changer 3.2
- DFX 7
- Energy Bliss Vis For Windows Media Player
- Jet Audio 6.2
- nVIDIA DVD PLAYER 2.55
- Power DVD V6.0 Delux
- Quick Time v6.6
- Real Player 10.5
- RM to AVI MPEG WMV VCD SVCD DVD Converter v1.2.4
- TextSound 2.3
- Video CDCutter 4.04
- Winamp v5.08 Pro
- Winter Fun Packs

## بەشی Mobile Tools




- Acoustica Mp3 To Wave Converter Plus v2.5
- Mobi MB v2005
- Oxygen Phone Manager II for SymbianOPM 2.5.6
- Oxygen Ringtone Work shop
- SMS

## بەشی Utilities




- Athan Basic v2.0
- Bad Copy Pro V3.75 Build 0608
- Cloc X v1.4
- Dream Screen Saver Maker 2.7
- Error Guard v2.5
- File Recovery Angel v1.0
- Final Fantasy XI Theme
- Golden Al-Wafi
- Icon Cool Editor v3.4
- Lock Files and Folders 1.4 New
- NFSU Dynamic Desktop
- QURAN
- RAD TOOLS
- Recover My Files v2.8
- Registry Clean Expert v3.57
- RightClick 1.0 Enhanced
- Serials 2004 v1.3.1

## کتێبی فێرکاری بە زمانی عەرەبی






- Visual Basic
- Photo Shop
- Site Under Attack.PDF
- ORACLE
- other
- C++
- DOS
- SQL

# بەرنـــــــامەی
# Paragon CD Emulator

ئا: دلاوەر هەژار

ئەو بەرنامەیە سودی لیٚ وەردەگیریٚت بۆ ئەوەی بتوانی کۆمپیوتەر وەك ئامیٚریٚکی کۆپی بە کۆمەڵ بەکاربهیٚنیت وە ئەو بەرنامەیە چەند رەقیبیٚکی هەیە کە هەموویان هەمان کاردەکەن بەڵام وەك ئەو بەرنامەیە سەرکەوتوو نین ئەوانی تر زیان بەسی دی یەکان دەهیٚنن بەڵام ئەم بەرنامەیە بەپیٚی تاقیکردنەوە سەرکەوتنیٚکی باشی بەدەست هیٚناوە.



سەرەتا پـــاش دابەزاندنی لـــەســـەر کـۆمپیوتـــەر بەرنامەکـــە دەکەینەوە لـــەســـەرەوە Image دەکـــەینـــەوە لـــەویٚوە Grete Cd Image کلیـك دەکـەین ئینجـا next دەکـەین بـەم شیٚوەیە ویٚنە ١

وینە (١)



پاشان سیٚ لیستی تر بەدوای یەك دیٚن هەر سیٚ لیست next دەکەین ئینجا چاوەریٚ دەکەیت تا تەواوبوونی کۆپی یەکە ویٚنە٢

وینە (٢)



# چۆنیتی وێنە گرتن لە پارچە (ڤیدیۆ) یەك و جوڵانەوەی لە بەرنامەی (میدیا ستودیۆ)

ئا: فاخر مەحمود

هەر وەك لە زنجیرەکانی پێشو بەرنامەی میدیا ستودیۆ باسمان کردوە کە ئەم بەرنامەیە بەرنامەیەکی زۆر گرنکە بۆ مۆنتاژو دۆبلاژ میکسەر .

خوێنەران ئاگادار دەکەینەوە کەوا ( میدیا ستودیۆ ) ڤێرژنی نوێ دابەزیوە لە بازێرەکان دەست دەکەوێت چەند گۆران کاریەك هەیە ئەویش لە کۆتایی ئەو زنجیرە باسی لی دەکەین .

لەم زنجیرە باسی چۆنیەتی وێنە گرتن لە پارچەك ( ڤیدیو ) وەردەگرین وە چۆن دەتوانین بە شێوەیکی جوان بی کەینە جولە.

لە سەرەتا دا دەچینە سەر file کلیك دەکەینە سەر open پارچە ڤیدیو کە دەهێنینە ناوی وەك وێنە ١ .




وینە ژمارە (١)

پاشان کە ڤیدیوکەمان هێنا دەیخەینە سەر چینی یەکەم وەك وێنەی ٢ .



وێنە (٢)

فرێمەکە دەخینە سەر ئەم وێنەیی کە دەمانەوی بیگرین هەر وەك وێنە ٣ .



وێنە (٣)

لــــە دوای ئـەوە دەچیتە ســــەر ئـەو چوارگوشەی کــە وێنــەی ڤیدیوکـــە پیشـــان دەدات دەچیتــە ســــەر preview window menu وەك وێنە ٤ .



وێنە ( ٤ )

کلیك دەکەینە سەر ئەم ئایکونە دەبینین لیستێك دەکرێتەوە کەوا ئەم لیستە زۆر کاری بەخۆوە گرتوە بەڵام ئەوەی لای ئێمە گرنگە ئەو وێنە گرتنە ئەویش لیستەکە دەچینە سەر Save Image to لەوێشەوە دەچینە سەر Image File هەر وەك وێنە ٥ .



وێنە ( ٥ )



دەبینین چوار گوشەیەك دەبیتەوە ئەویش بۆ Save كردنی وێنەكەیە خۆت شوێنەكی دیاری دەكەیت و ناویكی لێ دەنێن . لێرەدا وێنەكە Save دەبیت لەم شوێنەی كە دیاریت كردبوو وەك وێنە ٦ .



وێنە (٦)

ئەم جارەیان دەچینە سەر ئەم شوێنەی كە وێنەكەمان دانابو دەچینە سەر Insert Image File وەك وێنە ٧ .




وێنە (٧)



پاش ئەوی کە وێنەکەمان هێنا دای دەنێینە سەر فرێمەکە بە مەرجێک فرێمەکە لە شوێنی خۆی نەجولێنیت وەک وێنە ٨

وێنە ( ٨ )



پاشان وێنەکە درێژ دەکەینەوە بەو شێوەی کە خۆمان دەمانەوی وەک وێنە ٩ .

وێنە ( ٩ )




پاشان کە تەواو بوین ریندەری ئەکەین وەک وێنە ١٠ .

وێنە ( ١٠ )

# بەرنـــــــامەی
# ULEAD DVD PICTURESHOW SE

ئا: ئالآن شێروان

ئەو بەرنامەیە سوودی لێوەردەگیرێت بۆ ریزکردنی وێنەو هەروەها نیشاندانی بەشێوەی کلیپ کە دەتوانیت دەنگیش لەگەڵ وێنەکان دابنێیت بێگومان ئەوکارە زۆر پێویستە زۆرجار ئێمە کۆمەڵە وێنەکمان هەیە دەمانەوێ لێکیان دەین بە شێوەی فلیمی وهەروەها گۆرانیشی لەگەڵ بێت.



سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە لەسەرەوە دوو هەڵبژێردراو هەیە یەکەمیان vcd 2.0 و ئەویتریان DVD یە واتا دەتوانی ڕاستەو خۆ پاش تەواوبوونی کارەکانت کۆپی بکەیت بەشێوەی vcd و هەروەها بەشێوەی DVD ئێستا دێین یەکەمیان هەڵدەبژێرین ئەویش بریتی‌یە لە vcd ئینجا NEXT دەکەین لیستێکی تر دێتە بەرچاو بەم شێوەیە وێنـــــە ١

وینە ژمارە (١)

ئینجا لەسەرەوەی ئەم لیستە Add SlideShow هەیە یەك جار بەماوس کلیکی لەسەردەکەین لیستێکی تر دەبێتەوە ئەویش لیستی بەرنامەکەیە هاردەکان شیدەکاتەوە پێت دەڵێت کام وێنەت دەوێ دەست نیشانی بکە هەروەها لەلای چەپ لەخوارەوە دوو نوسراو هەیە زۆر گرنگن یەکەمیـــان SlideShow title ە و ئەویتریان Background music ە یەکەمەیان سودی لێوەردەگیرێت بۆ نووسین واتا هەر نووسینێك بکەیت لەسەر وێنەکان دیار دەبێت ئەمەش زۆر پێویستە ئەویتریان سوودی لێوەردەگیرێت بۆ دانانی گۆرانی یاخود مۆسیقا لەگەڵ وێنەکان گوێبیست دەبین پاشان بەهۆی ماوس ئەو وێنانەی پێویستمانە دیاری دەکەین پاشان Add Image لێدەدەین دەبینین ئەو وێنانەی دیاریمانکردوە دێتە ناو بەرنامەکە وێنـــــە ٢



وینە ژمارە (٢)

ئینجا لەخوارەوە Done هەیە بەماوس کلیکێك لەسەری دەکەین پاشان NEXT لێدەدەین لیستێك دەکەوێتە بەرچاو بەم شێوەیە وێنـــە ٣




وێنە ژمارە (٣)

لەسەرەوە لەڕێگای Project temrlate دەتوانیت باگراوندی وێنەکان بگۆڕیت پاشان دووبارە NEXT لێدەدەین دیسان لیستێکی تر دێت دیسان NEXT لێدەدەین ئینجا لیستی کۆتایی دیت بەمەرجێك دەبێت ئامێری کۆمپیوتەرەکەت رایتەری لەسەر بێت ئینجا سی دی بەتاڵ دەخەینە سەر رایتەر و دووبارە NEXT دەکەین سەیردەکەین ئەوکارەی کردمان دەبێتە بەشێکی ڤیدیۆ ودەچێتە سەر سیدی کە دواتر دەتوانین بە ئامێری ڤیدیۆ سیدی ئەو سیدیە بەکار بهێنین.

## ئاگـــــــــاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیـە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سـەردا نمان بکـەن یـان بابەتـەکانیان بنێـرن بـۆ ئـەم ناونیشانە .

هەرێمی کوردستانی عێراق / ناو بازار بەرامبەر دەرگای قەلا بالەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوێنی مەڵبەندی کۆمپیوتەر ئاراس یان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاریا فۆن ٢٥٢٧٠٥٤ یان مۆبایلی کۆرەك ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان بە هۆی پۆستی ئەلکترۆنی

Email : aras_co_center@yahoo.com یان computer_magazine_2005@yahoo.com

# زنجیره ( ٩ )
# له بەرنامەی فـــلاش Mx

فەیسەل مەعروف

**کتێبخانه ( بەشی دووەم )**

لەم بەشەی کتێبخانه هەوڵدەدەین وانەیەکی کردەیی جێبەجێ بکەین کە بریتی یە لە دروستکردنی دەقێك بە پێوەری جیا بە سوود وەرگرتن لە تایبەتمەندیەکانی کتێبخانە و دروستکردنی قالب:

١. پەنجەرەی کتێبخانە دەکەینەوە بە کلیك کردنی هەردوو دوگمەی Ctrl+I وە لە لیستی Option لە پەنجەرەی کتێبخانە فەرمانی New Symbol هەڵدەبژێرین ، بۆ جۆری هێمایەکەش Graphic هەڵدەبژێرین ، پەنجەرەیەکی سەربەخۆمان بۆ دەکرێتەوە بۆ دەستکاری هێمایەکە ، دەقێك دەنووسین بە بەکار هێنانی ئامرازی دەق (A) و (Group Sadaa)دەنووسین . (وێنەی ١).




وێنە (١)

٢. دەگەڕێینەوە پەنجەرەی دەستکاری دیمەن بە کلیك کردنی دوگمەی scene1 بۆ گەڕانەوەمان بۆ پەنجەرەی دەستکاری دیمەن، هێمایەکە لە کتێبخانە ڕادەکێشینە پەنجەرەی وێنە و لە ناوەڕاستی پەنجەرەکە دای دەنێین پاشان لە چوار چێوەی ژمارە (١٠) چوار چێوەی کلیلی بۆ زیاد دەکەین ئەوەیش بە کلیك کردنی دوگمەی F6.

٣. چینێکی نوێ زیاد دەکەین و دەقێك لەم چینە دەنووسین لەگەڵ زیاد کردنی هێمایەك لە کتێبخانە لە چوار چێوەی یەکەم ، هەوڵدەدەین کەوا دەقەکان لە یەك ئاستدا بن•

٤. چینێکی نوێ زیاد دەکەین (چینی ژێرەوە) لە چوار چێوەی ژمارە (١٠) وە چوار چێوەی کلیل Key frame ی بۆ زیاد دەکەین بە داگرتنی F٦ ، پاشان لە هەمان چوار چێوە دەقەکە گەورە دەکەین بە هۆی ئامرازی قەبارە و ڕادەکێشین بەرەو ڕاستە تاوەکو قەبارەی دەق گەورە بێت بە هەمان شێوە چینی سەرەوەش دەستکاری دەکەین ، پاشان هەڵدەستین بە زیاد کردنی کاریگەری Alpha بۆ هەر یەك لە چینی سەرەوە و خوارەوە لە چوار چێوەی ژمارە (١٠ ) لە تابلۆی Properties لە لیستی Color فەرمانی Alpha هەڵدەبژێرین وە بەهاکەی دەکەینە (سفر). (وێنەی ٢)٠




وێنە (٢)

٥. لە تابلۆی Properties جوولـەی جۆری Motion بۆ چینەکان لە چوار چێوەی ژمارە(١) زیاد دەکەین ، ئینجا جوولەکە جێبەجێ دەکەین بە داگرتنی هەردوو دوگمەی ( Ctrl+Enter ). یەکێ لە سوودەکانی بەکار هێنانی دەقەکان لە فلاشدا ئەوەیە دەتوانین دووبارە دەقەکان بە کار بهێنین کە پێشتر نووسیومانە٠

# بەرنامەیەکی زۆربەهێز بۆهێنانی ڤیدیۆ بۆ ناوکۆمپیوتەر هەروەها بۆ کاری مۆنتاج VideoImpression2 بەشی یەکەم

ئا: سەردار فەتاح

بەرێزان بە ڕاستی دەستکەوتنی بەرنامەی لەم جۆرە دەگمەنە من خۆم کەچاوم پێکەوت لەلایەن هاورێیەکی خۆشەویستم سەرسامی ئەم بەرنامە بەهێزە بووم بۆیە داوام لێکرد دەست بەجێ ئەم بەرنامەیەم پێ بدات پاش ئەوەی باسی گۆڤاری کۆمپیوتەرم بۆکرد ئەویش بەدڵێکی فراوان دەست خۆشی لەم ستافە کرد داوای زیاتر بەرەوپێشەوە چوونی ئەم گۆڤارەی کردوو ئەم بەرنامەیەی پێبەخشیم منیش بە باشم زانی بۆ ئێوەی بەرێز ئەم بەرنامەیە باس بکەم خۆشەویستان بەرنامەی VideoImpression 2 شتێکی زۆرنایابە بەتایبەتی کە ئێستا بەرەوجامی جیهانی دەڕۆین کەچەند پێویستمانە لەرێگەی بەرنامەیەکەوە ڤیدیۆ بێنینە ناوکۆمپیوتەرەکانمان بەرێزان لەرێگای ئەم بەرنامەیە هەر چ جۆرە کارتێکمان هەبێت دەتوانین تەلەفزیۆن بگوازینەوە بۆناو کۆمپیوتەر هەروەها لەکاری مۆنتاج من تا ئێستا شتی وام هەرگیز نەدیوە کە بتوانێت لە ناو یەك بەرنامە تێکرای مۆنتاج تەواو هەبێت واتا باکگراوندو جوڵەو دەنگ و چوارچێوە واتا تۆ ئەگەر پارچە ڤیدیۆیەك تۆماربکەیت بۆناوکۆمپیوتەرەکەت دەتوانیت بە جوانترین شێوە مۆنتاجی بکەیت ئینجا چ لەرووی باکگراندنو یاخود گۆرینی ڕەنگی ڤیدیۆکە یان هەرشتێك بێت دەتوانیت بە جوانترین شێوە مۆنتاجێك بەدەست بێنیت بەرێزان لەم بەشەدا تەنها باس لە چۆنیەتی هێنانی تەلەفزیۆن یاخود سەتەلایت یان هەر ڤیدیۆێك بۆناو ئەو بەرنامەیە دەکەین سەرەتا پاش کردنەوەی سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە دێیت بەرنامەکە دەکەیتەوە وێنە ١




وێنە (١)

سەیری ناوەڕاستی بەرنامەکە بکە سێ نوسراو هەیە ئێمە لەم بەشەدا تەنها پێویستمان بە نوسراوی ناوەڕاست دەبێت کە بریتیە لە Great a New Video کلیکێکی لەسەردەکەین لیستی دووەم دەبێتەوە لەم لیستەش Capture From Divice لێدەدەین وێنە ٢




وێنە (٢)

لیستی سێیەم دەبێتەوە بەم شێوەیە وێنە ٣




وێنە (٣)

لەم لیستەدا تەنها پێویستمان بە ریکۆرد دەبێت کە هێماکەی سورە بەڵام لەژێر شاشەکە کە یەکەمیان Settings کە بۆ زیادکردنی ڕەنگی ڤیدیۆ بەکاردێت لەگەڵ ڕەونەقی و ئاڵکردن و لێڵکردن بەکاردێت وێنە٤



وێنە (٤)

هەروەها دووەمیان format ە کەبۆ گەورەییو بچووکی قەبارەی ڤیدیۆکە بەکاردێت وێنە ٥



وێنە (٥)

هـەروەها سێیەم بریتیـە لـە in put کـە بۆ هێنانـە ژورەوەی ڤیدیۆیـە بەهەڵبژاردنیvideo composite In: ١ دەبێتـە AVI هەروەها بە هەڵبژاردنی VIDEO TUNER IN: ٠ تەلەفزیۆن دێتە ناو کۆمپیوتەر پاشان ریکۆرد لێدەدەیت تابتەوێ تۆماردەبێت .



# زنجیرەی ٧ لە بەرنــــــامەی AutoCAD

ئا:غزالة يونس

بە ڕێزانم لە زنجیرە ی ئە م جارە شدا باس لە فرمانەکانی لیستی وێنە کردن دەکەم بەهیوای ئەوەم سوودتان لە زنجیرە کانی پێشوو وەرگرتبێت.

.TEXT-١



بە ڕێزانم ئەم بەرنامەیەش وەك هەموو بەرنامەکانی تردە توانین ئەو شتانەی دەمانە وێت لە سەر وێنە کان بنووسین ودەستکاری لە نووسینەکە بکەین وەك گۆڕینی جۆروڕەنگ وقەبارەی نووسینەکە جالێرەدا هێنانی ئەم فرمانە لە لیستی وێنە کردن دا بەسیٚ ڕێگا دەتوانین بانگی بکە ین :

١-نووسینی ووشەی TEXT لە شریتی زانیارییەکان COMMAND .

٢-کلیك کردن لە سەر TEXT لە شریتی کەرستەکان .

٣-لە لیستی وێنە کردن دەست نیشان کردن دەچینە سەر TEXT ئینجا دەست نیشان کردنی Mulitiline Text. وێنەی (١).



پاش بانگ کردنی فرمانەکە ئەوا لە شریتی زانیارییەکان ،اوات لێدەکات خاڵی سەرەتای دەست پێکردنت دەست نیشان بکەیت .کە واتە دەتوانیت کلیکی یەکەم بکەیت وپەنجەت لە سەر ماوس هەڵنەگریت دەستت ڕاکێشیت لە سەر ڕووبەری بەرنامەکە تاکلیکی دووەمیش دەکەیت. ئینجا چوار گۆشەیەك دێت بۆ نموونە ووشەی COMPUTER بنووسین (وێنەی ٢).



جا دەتوانیت نووسینەکەمان دەست کاری بکەین بەو زمانەی کە دەتەوێت ، بۆ نموونە ئەگەر قەبارەی نووسینەکە ٢٠ ڕەنگی سوورە جۆری زمانە کەش بەدڵی خۆت دە ست نیشانی دەکەیت.پاش گۆڕینی یان تەواوبوون لە نووسینەکە لەسەر O.Kکلیك دەکەین نووسینەکەمان دێتە سەر ڕووبەری بەرنامە . (وێنە ی ٣).



بەلام جۆری دووەم کە singleline text کە هەر لەلیستی Drow دووبارە دەست نیشانی دەکەین (وێنەی ٤)

لەم جۆرەدا لە شریتی زانیاریەکان داوای خالّی دەست پێکردن دەکات تۆش دەتوانیت کلیك بکەیت یان بۆ نموونە خالّی دەست پێکردنت ٥٠،٥٠ بێت ئینجا داوای بەرزی نووسینەکە دەکات بۆ نموونە بەرزی (١٠) پاشان داوادەکات نووسینەکەت بە چ گۆشەیەك بێت بۆ نموونە بەگۆشەی (٠).



**Specify start point of text or [Justify/Style:-50,50 ENTER**
**Specify height <10.0000 ENTER**
**Specify rotation angle of text <0 ENTER**

پاشان تیری ماوست کاریگەرە بەو ووشانەی کە دەنووسرێت بۆ نموونە ووشەی COMPUTER بنووسە ئینجا کلیك لە شوێنێکی تر بکە بۆ نموونە ووشەی AutoCAD بنووسە بەم جۆرە لە هەر شوێنێك حەزدەکەیت کلیك لەوشوێنە بکە (وێنەی ٥).



HATCH-٢

لێرەدا ئەم فرمانە لە زۆر لا دەتوانین بەکاری بهێنین وێنەکانمان بەپێی پێویست شێوەی دیاری کراوی بۆ تەرخان بکەین چەندین جۆری HATCH تێداپیشان بدەین لێرەدا بە ئارەزووی خۆمان دەست نیشانی دەکە ین .

بانگ کردنی ئە م فرمانە ش وەك هە موو فرمانە کانی تر لە:

١-کلیك کردن لە سەر HATCH لە شریتی کەرستەکان .

٢-لە لیستی وێنە کردن دەست نیشان کردن HATCH لێرەدا سەرەتا تاقی بکەرەوە وێنەی بازنە یەك بکێشە ئینجا بانگی فرمانەکە بکە (وێنەی ٦).

پاشان چوار گۆشە یەك دێت (وێنەی ٧)

وێنەی (٧)

لـەم چوار گۆشـەیەدا دەتـوانین رەنـگ وشـێوە وقەبارەی HATCH دەست نیـشان بكـەین . لە بەشی سەرەوەی پەنجەرە كە PATTERN یـان چوار گۆشـەیەكی بـچووك لـە تەنیـشتی هەیە بەكلیك كردن لەسەری ئەوا لیستێك یان بـە شـێوەی پەنجەرەیـەكی تـر لـە شـێوەی جیاجیا دێتە پێش چاو (وێنەی ٨)

وێنەی (٨)

وێنەی (٩)

بۆ نموونە لەسەر شێوەی دیوارە كلیك بكە كە ئینجا OKپاشان دەچینە سەر SCALE بۆ دەست كاری كردن لە قەبارەی شێوەكە. وە لە ریزی سەرەوە دەستەراستی خۆمان PICK POINTS هەیـە ئـەمیش بـۆ دەسـت نیـشانكردنی ئـەو شـێوەیە بـەكاردێت كـە دەتـەوێت HATCH بكـەیت بـۆ یـە كلیـك لەسەر PICK POINTS دە كـەین بە كلیك كردن پەنجەرە كە نامێنێت وتۆش ئەو كات دەتوانیت كلیك لەناو چەقی بازنەك بكەیت كە پێش تر وێنەت بۆ كێشابووپاشان ENTER دەكەیت پاش كلیك كردن پەنجەرە كە دەگەرێتەوە بۆ جێبەجێكردنی فرمانەكە دەتوانین Ok بكەیت (وێنەی ٩).



# چۆنیەتی بەرزکردنەوە ونزم کردنەوەی تۆنی دەنگ لەبەرنامەی Cool Edit Pro

ئا: کاوە سلیمان

بەرێزان وەك هەموو زنجیرەکانی پێشوو وا لەم زنجیرەیەشدا باس لە کارێکی زۆر گرنگی بەرنامەی کوول ئیدت پرۆ دەکەین خۆشەویستان پێویست بە وەناکات کەلە چاکی ئەو بەرنامەیە بدوێین چوونکە هەرچەندی بەسەردا بلێین ناگاتە ئاستی ئەو کارە مەزنەی کە piter ئەنجامیدا ئەویش دروست کردنی بەرنامەی Cool Edit Pro بوو کە بەڕاستی هەمــوو جیهان پێویستی بە بەرنامەیەکی لـــەم جـۆرە هەبـوو کە تەوای ئەو گۆرانکـاریانـەی بەســەر دەنگ دا دێـن Cool Edit Pro دەتـوانـی هـەرهـەمـوویـان بەسەرکەوتووی ئەنجام بدات کرداری بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی تۆنی دەنگ شتێکی زۆر پێویستە هەموومان کارمان پێی دەبێت بەتایبەتی ئەوانەی کاری ستۆدیۆکان یاخود دۆبلاجی فلیم و ئەفلام کارتۆن و شتی تردەکەن ئەم کارەش سەرەتا دێین بەرنامـەکە دەکـەینـەوە ئینـجا ئـەو دەنـگـەی پێویستمانە دێنینە ناو بەرنامەکە پاشان ئەو شوێنەی پێویستمانە دەستکاری بکەین بە ماوس دیاری دەکەین ئینجا دێین Effects دەکەینەوە لەوێوەش Time/Pitch دەکـەینـەوە لـەوێـوەش Pitch Bender هەلدەبژێرین بەم شێوەیە وێنە ١



وینە ژمارە (١)

پاشان لیستێك دەبێتەوە لەناوەڕاستی لیستـەکە Flat نوسـراوە یـەکـەم جار بـەماوس کلـیـکـی لـەسـەردەکـەین بۆئەوەی دەنگەکە بێتەوە باری ئاسایی خۆی پاشان لە ناوەڕاستی ئەم لیستە هێلێکی ڕاست دیاریکراوە تۆ ئەو هێلە بەرزو نزم دەکەیتەوە دەنگەکەش بەگوێرەی ئەم هێلە بەرزو نزم دەبێت هەروەها لەرێگای prevew دەتوانی گوێبیستی گۆرانکاریەکان بیت ئینجا ئۆکەی دەکەیت وێنە٢



وینە ژمارە (٢)

# زنجیره ( ٩ )
# لە بەرنامەی Adobe Premier

ئا : فەیسەل گەردی

چینەکان

هەمووئەو کارانەی ئەنجامی دەدەین وەك (برین و درێژکردنەوە وگواستنەوەی دیمەنەکان و زیاد کردنی کاریگەریەکان و دەق و دەنگ ...هتد) لە بەرنامەی Adobe لە ڕێگای چینەکانەوەیە ، بۆیە چینەکان بنچینەی کارکردنە:




١. لە Adobe چینی ڤیدیۆیی ژێرەوە بریتییە لە چینی یەکەم video١ کە لە دوو چینی تر پێك هاتووە ، ئەو چینەی دێتە سەر چینی ڤیدیۆیی یەکەم بریتی یە لە video٢وپاشان video٣.....هتد ،چینی ڤیدیۆیی چینی یەکەم دادەپۆشێت و هەروەها چینی ڤیدیۆیی سێیەم بابەتەکانی ژێر خۆی لە چینی ڤیدیۆیی دووەم دادەپۆشێ.... (وێنەی١)٠

وێنە (١)

٢. جگە لە چینی ڤیدیۆیی یەکەم هەر چینێك لە چینەکان بەهایەکی داپۆشێنەری هەیە کە یەکسانە بە ١٠٠٪ واتە هەر چینێك ڕێژەکەی بگاتە ١٠٠٪ ئەوا چینی ژێرەوەی خۆی بە تەواوی دادەپۆشێ، ئەم بەهایە پێشتر ئامادە کراوە و دەتوانین دەستکاری بکەین، کەم کردنەوەی ئەم ڕێژەیەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی چینی ژێرەوە بە شێوەیەکی ڕوون . ئێستا ئەو بەشەی کە پێشتر بڕی بوومان دەیگوازینەوە بۆ ئەو چینەی دەتوانین دەستکاری شێوەی دەرکەوتنی بکەین٠




٣. هێڵی دەستکاری دەبینە سەرەتای بەشە بڕاوەکەی کە لە سەرخۆ دەجوڵێ (شێوەی پایسکل )ە کە دیارە کە لە چرکەی (١١,٢١)ە ، (وێنەی٢)٠

وێنە (٢)

٤. بەشەکە دەگوازینەوە بۆ چینی ڤیدیۆیی دووەم .(وێنەی٣)٠




وێنە (٣)

٥. گۆڕانکاری لە تایبەتمەندی چینەکە دەکەین بۆ ئەوەی لە هەندێ شوێن ڕووناک بێت ، چینەکە فراوان دەکەین ، دەبێ دڵنیا بین کەوا فەرمانی Opacity کارا بێت. (وێنەی٤)٠




وێنە (٤)

هەروەها دەبێ ئامرازی هەڵبژاردنیش Selection کارا بێت .(وێنەی٥).




وێنە (٥)




٦. دەچینە سەر ناوەراستی دیمەنەکە و کۆرسەری ماوس دەجولێنین و شریتە سوورەکەی تایبەت بە تاریک و ڕوونکردن کلیك دەکەین بۆ دروست کردنی کلیلCreate key. (وێنەی٧)•

وێنە (٦)




٧. دیمەنەکە تا کۆتایی دەجولێنین وە کلیلەکە لە شریتەکە بۆ خوارەوە دەجولێنین (خالی سفر). (وێنەی ٧)•

وێنە (٧)

٨. ئێستا کرداری بینین ئەنجام دەدەین بۆ دیمەنەکە و سەیری دەکەین کەوا دیمەنەکە چۆن بەرە بەرە تاریك دەبێ تا بە تەواوی دادەپۆشرێ و نامینێ.



وێنە (٨)

# وەرگێرانی فایلی جۆری DVD بۆ جۆری ڤیدیۆ سی دی بەشێوەیەکی ئاسان Win Avi

ئا: شەهین

بەڕێزان زۆرجار ئێمە گیروگرفتی ئەوەمان دێتە پێش کە جۆرێکی ڤیدیۆ لە ئەنتەرنێت داوون لۆد دەکەین یاخود سیدیێکی گرنگمان بۆدێت لەدەرەوە دەبینین گرفتی ئەوەی هەیە کە کارناکات لەسەر ئامێری ڤیدیۆ سیدیەکانمان یاخود لەسەر کۆمپیوتەر نابێتەوە ئەو کاتە پێویستمان بە بەرنامەیەك دەبێت کە ئەم جۆرە فایلەمان بۆ بگۆڕێت بۆ جۆرێك کە سوودی لێوەربگیرێت بەرنامەی WinAvi ئەم کارە ئەنجام دەدات جگـــە لـــەوەش دەتوانێت بە پێچەوانـــەوەش ئـــەم کارە ئەنجـــام بدات واتـــا گۆڕینی جۆری ڤیدیۆ سیدی بـــۆ جۆری دیڤیدی هەروەهـــا دەتـــوانێ فایلی جۆری avi wmv mv1 wma mpeg2 بگۆڕێت بۆ ڤیدیۆ سیدی ئەنجام دانی ئەو کارەش یەکجار ئاسانانە سەرەتا پاش دابەزاندنی ئەو بەرنامە لەسەر کۆمپیوتەرەکانمان دێین بەرنامەکە دەکەینەوە دەبینین چەند چەماوەیەکی تێدایە کەهەر یەکەو کاری تایبەت بەخۆی ئەنجام دەدات لەلای ڕاست لە خوارەوە لەناو کەوانەیەك DVD دیارە بەماس جارێك کلیکی لەسەردەکەین دەبینین لیستی هاردەکان دەبێتە بەم شێوەیە وێنە ١




وێنە (١)

پاشان ئەو پارچە ڤیدیۆیەی کە دەمانەوێ بیگۆڕین یەکجار کلیکی لەسەر دەکەین ئینجا OPENلێدەدەین وێنە ٢




وێنە (٢)

پاشان لیستێکی تردەبێتەوە لە بۆشایی خوارەوەی ئەم لیستە DVD نوسراوە یەکجار کلیك لەسەر ئەم بۆشایی یە دەکەین DVD یەکە دەبێتەوە کە لە ژێرەوەی MINI DVD VCD MPG١ MPG٢ هەیە ئێمە دێین VCD هەڵدەبژێرین ئینجا لە ژێرەوە پیتی( ب ) لێدەدەین پاشان دەوەستین تا تەواو دەبێت وێنە ٣




وێنە (٣)

# بەرنامەی
# panorama maker 3.0

ئا: سازان رزگار عبدالرحمن

ئەم بەرنامەیە تایبەتمەندە وێنەکاری زۆر گرنگی پیێ ئەنجام دەدرێت، وە خەلکێکی زۆر دەتوانن سودی لیێ وەر بگرن لە بوارەکانی کاردا بۆ نمونە گەر بمانەوێ وێنەی شوێنێك بگرین بەلاّم لەبەر گەورەیی رووبەرەکە ناگیرێت وە یاخود دەمانەوی وێنەی شوێنێك بگرین لە سێ یاخود چوار لاوە، ئەویش بکەین بە یەك وێنە بەشێوەیەکی جولە بیبینین لە هەموو لایەکەوە ئەم بەرنامەیە زۆر کارمان بۆ ئاسان دەکات.

یەکەم جار هەڵدەستین بە دابەزاندنی بەرنامەکە پاشان کاری لە سەر ئەکەین ئەمەش روو و(واجهة)ی بەرنامەکەیە هەروەك لە وێنە ١ دیارە.



وینە (١)

پاشان کلیك ئەکەین لە سەر start رووی بەرنامەکە ئەگۆڕێ ئەویش چەند هەلبـژاردنێکی تێدایە بۆ هەڵبژاردنی جۆری وێنەکە ، ئەویش کەوا چوار جۆرە هەر وەك لە وێنە ٢ دەردەکەوێت.



وینە (٢)



وە لـــەلای ســـەرەوەی بەرنامەكـــە دوو هەڵبژاردنی تیٚ دایە یەكەمیان بۆ جۆری ڕووبەرە ئەوی تریان بۆ گەورە وبچوك ومام ناوەندی وێنەكەیە. پـــاش ئـــەوەی كـــە ئەمانـەمان هەڵبـژارد كلیك دەكـەین لەسـەر Next .دەبینـین لاپەڕەیـەكی تـر دەبێتـەوە وەك لە وێنە ٣ دیارە.

وینە (٣)



كلیك دەكەین لە سەر add ئەو وێنانەی كە مەبستمانە ئەهێنینە ناو بەرنامەكە پاشان كلیـك دەكـەین لـە سـەر Next دەبینـین بەرنامەكە وێنەكان لێك ئەدا بەیەك وێنـــە ونیـــشانمان ئـــەدات وەك لـــە وێنـــە ٤ بەرچاومان دەكەوێت.

وینە (٤)



پاشان كلیك لە سەر Panorama دەكەین بۆ ئەوەی وێنەكە بە شێوەیەكی بازنەیی لیٚ بێت وسەیری بكرێت.

پاشـان كلیـك لـە سـەر Save دەكـەین بـۆ خەزن كردنی لە ناو كۆمپیوتەرەكـەمان گـەر بمانەوێت.

وینە (٥)

# ( ERROR DOCTOR 2006 )
# لابردنی هەڵە لە کۆمپیوتەرەکەت

ئا: بەختیار سەباح رەواندزی
Baxtear_80@yahoo.com

زۆر لە ئێمە لە کاتی کارکردنمان لەسەر کۆمپیوتەر، کێشەیەك ڕووبەڕومان بۆتەوە، ئەویش خاووبونەوەی کۆمپیوتەرو، نەکرانەوەی بەرنامەکان بە ئاسانی و ڕاوەستانی کۆمپیوتەر، ئەمەش تووشی بێزاریمان دەکات. هۆیەکەشی دەگەڕێتـــەوە، بۆ بوونـــی هەڵــە لە نـــاو سیستەمی کۆمپیوتەرەکەمـــان و زیـــادبوونـــی ئیرۆر.

بەرنـــامەی ( Error docotor2006) لەم کێشەیە ڕزگارمان دەکات. پاش ئەوەی بەرنامەکـــە دەکەینـــــەوە، کلیـــك لەســـــەر ( SCAN NOW) دەکەین، هەڵدەستێت بە پشکنینی تەواوی سیستەمەکەو چاککردنی هەڵەکان، هەروەك لە وێنەی ژمارە ( ١ )




وینە ژمارە (١)

دوای ئـــەوەی پشکنینەکە تـــەواو بوو، هەموو هەڵەکانی دۆزیەوە، بۆ لابردنیان کلیك لەسەر (REMOVE) دەکەین و بەم شێوەیە لە ئیرۆر ڕزگارمان دەبێت. سەیری وێنە ژمارە ( ٢ ) بکە کە هەڵەکانی دۆزیوەتەوە .




وینە ژمارە (٢)

# ٣٨ ڕێنمایی بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەر

زنجیرەی حەوتەم

ئا: شاخەوان عمر حسن
shakhawano@yahoo.com

٢٤ - بۆکسی ئاگادارکردنەوە

کاتێك بەرنامەیەك لەکار دەکەوێت یان فایلەکانی دەسڕێنەوە ئەوا لە کاتی داگیرساندنی کۆمپیوتەر یەکسەر بۆکسێکی ئاگادار کردنەوە دێتە سەر شاشە بەمەش ئامادەبوونی سیستەم بۆ کارکردن دوا دەکەوێت وە لەوانەیە ئەم بۆکسە چەند جارێك دووبارە بێتەوە بۆ ئەوەی لەم حاڵەتە رزگاریمان بێت و کرداری خێراکردنی کۆمپیوتەر بە تەواوی دیارکەوێت ئەوا لە ڕێگای فەرمانی (Run) دەچینە سەر regedit پاشان بۆکسێکی تر دەکرێتەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (١)



وینه ژماره (١)

پاشان دەچیتە سەر KEY_LOCAL_MACHINE دوایی کلیك لەسەر SOFTWARE پاشان Microsoft هەڵدەبژێرین بڕوانە وێنەی (٢)



وینه ژماره (٢)





ئینجا كلیك لەسەر Windows NT دەكەین لە دوایدا CurrentVersion هەڵدەبژێرین بڕوانە وێنەی (٣). پاشان چەند فەرمانێك دەردەكەون ئێمە بە دوای AeDebug دەگەڕێن كە دۆزیمانەوە دوو كلیكی لەسەر دەكەین و دەیكەینەوە هەروەك لەوێنەی (٣)




وێنە ژمارە (٣)

دیارە پاشان لە بەشی ڕاستی بۆكسەكە دوو كلیك لەسەر Auto دەكەین و نرخەكەی لە یەكەوە دەكەینە سفر . بڕوانە وێنەی (٤) . .




بەمەش كردارێكی تری گرنگی ناو كۆمپیوتەرمان جێبەجێكرد مانای وایە هەنگاوێكی تریش چوینە پێش لە ڕێكخستنی كۆمپیوتەر .

وێنە ژمارە (٤)

## ٢٥ - دانانی دوو سیستەم لەسەر یەك کۆمپیوتەر

ئێمە لەسەرەتاوە باسمان کرد کە دژە ڤایرۆسەکان کاریگەریان هەیە لەسەر خێرایی کارکردنی کۆمپیوتەر وە کاتێك ئەم کاریگەریە زیاتر دەبێت کە دژە ڤایرۆسەکە کۆمپیوتەر بپشکنێت . لە هەمان کاتدا کاتێك بۆ هەر مەبەستێکی تر کۆمپیوتەر بپشکنیت ئەوا هەموو بەشەکانی کۆمپیوتەر دەپشکنێت بەمەش لە لایەك کرداری گەران و پشکنین دوا دەکەوێت لەلایەکی تر کۆمپیوتەر هێواش و لەسەرخۆ کار دەکات تا ئەم کردارە تەواو دەبێت . سەبارەت بەدژە ڤایرۆسەکان دەبێت کاتی وا دەست بکەین بە پشکنین و گەران کە هیچ کارێکی وا لە ناو کۆمپیوتەر نەکەین ، وە سەبارەت بە گەران پشکنینی ناو کۆمپیوتەر ئەوا کاتێك ئەم کردارە کاریگەری دەبێت کە کۆمپیوتەر دوو سیستەمی لەسەر بێت واتا بۆ نمونە لەسەر یەك قورس ویندۆزی ئێکس پی لەگەڵ ویندۆزی می داناوە بەمەش لەکاتی گەران کۆمپیوتەر خۆکاری هەردوو سیتەمەکە دەپشکنێت بەمەش کاریگەری زۆری دەبێت لەسەر کۆمپیوتەر بۆ ئەوەی ئەم کرادە دوبارە نەبێتەوە کۆمپیوتەر هەر سیستەمێك بە تەنیا بپشکنێت پێویستە کە لەرێگای فەرمانی Regedit ئەم فەرمانە رەت کەینەوە بەم شێوەیە لە دوای کردنەوەی فەرمانی Regedit وەك لەسەرەوە باسم کرد ئـەوا دەچینـــە ســەر سیستــەم (SYSTEM) پاشان کلیك لەســەر (CurrentControlSet) دەکەین بروانە وێنەی ژمارە (٥)



وینە ژمارە (٥)

پاشان کلیك لەسـەر (Control) دەکـەین ئینجا لەکۆتایی کلیك لەسەر (Manager Session) دەکەین پاشان لەبەشی راستی بۆکسـەکە بەدوای زاراوەی (BootExecute) دەگـەرێـن ئـەم فەرمانە دەکـەینـەوە دەبـینـین بۆکسێك دێت لە ناویـدا ئـەم زاراوە(autocheck autochk) نوسراوە ئێمـە دەیگـۆرین بۆ ناوی سیتـەمی بەکارهـاتـوو وە دوایـی کلـیـك لـەسـەر (OK) دەکەین . ئینجا هـەموو بۆکسـەکان دادەخـەین و کۆمپیوتەر دەکوژێنینەوەو دایـدەگیر سێنینـەوە. بەجێبەجێکردنی ئەم هەنگاوەش گۆرانکاریەکی تر لە خێرایی کۆمپیوتەر دەکەین .



وینە ژمارە (٦)

# چەند خاڵێکی گرنگ دەربارەی windows xp
## ( زنجیرەی یەکەم )

ئا: خۆشـناو

### ١. لابردنی حاڵەتی Hibernate .

ئەگـەر حاڵـەتی hibernate بـووە گرفتێك بـۆ ئامێرەکـەت یـاخود داگیرکردنـی بۆشـاییەکی زۆر لـەهارد دیسـك ، ئـەوا دەتوانی هەڵسی بەلابردنی ئـەم حاڵەتـه بـەم شێوەیە، لەبەشـــی control panel دەچینه سـەر ڕەمزی power option واته هەڵبژاردنەکانی پاوەر، وە هەڵبژاردەیhibernation دیاری دەکەین، وە دیاری کردنی خانەی Enable hibernation لادەبەین، دەبێتە هۆی لابردنـی حاڵەتی hibernation (وێنەی ژمارە ١) .




وێنه (١)



## ٢. لابردنی چەندین خزمەتگوزاری Services .

چـەندین خزمـەتگوزاری دەتـوانین لایـان بـەرین لـەکاتی کـارپێکردنی سیـستەمی وینـدۆز xp، وە بـۆ ناسـینی ئـەم خزمەتگوزارییانـە دوو کلیـك دەکـەین لەســەر ڕەمــزی administrative tools، وە دوو کلیکـــی تـــر دەکەیـن لـەســـەر (services)، دەبینـین لیـستێکمان دەداتـێ بـۆ ئـەم خزمەتگوزارییانـە ، وە بـە تـەنها کلیـك کـردن لەسـەر هەریـەکێکیان ئـەوا شـەرحێکمان دەداتـێ دەربارەی ئـەم خزمەتگوزارییە، وە بە دەبڵ کلیك کـردن لەسـەریان دەتوانین لـەکاریان بخـەین یـاخود کارپێکردنیـان بـە شـێوەی دەستی لـە لیـستی جـۆری دەسـتپێکردن (Type Startup)، وە خزمەتگوزارییەکان بریتین لە مانەی خوارەوە (وێنەی ژمارە ٢):-

Plug and Play Devices
Host Web Client
SSDP Discovery Services
Application
Fast Alerter
Clipboard
Indexing Service Management
Human Interface Devices
User Switching
Net Meeting
Messenger Net Logon
Help Session Manager
Remote Desktop
Routing QOQ RSVP
Remote Registry
Remote Access
Service universal



وێنە (٢)

## ٣. گەیشتن بە حاڵەتەکانی شاشە .

ئەگــەر ئێمــە حەزبکــەین بگــەین بــە حاڵەتــەکانی شاشــە بــە شــێوەیەکی ڕاستەوخۆ، نمونـە کەفائـەی ڕەنگـی ٢٥٦ یاخود هـی تر، ئەوا ئـەم ڕێگەیە دەگرینـە بەر، کلیکی ڕاستە دەکەین لەسەر ڕووبەری شاشە وە properties دیاری دەکەین، وە بەشـی setting هەڵدەبـژێرین وە کلیـك لەســـەر هەڵبژاردنـــەکانی پێـــشکەوتوو دەکـــەین (advanced)، وە کلیکـــی adapter دەکـەین وە لەسـەر پیـشاندانی هەمـــوو شێوەکانـی پیشاندانی شاشــە (List all modes) کلیك دەکـەین، ئێـستا دەبینـین لیـستێکمان بـۆ دەکرێتـەوە بـە هـەموو شێوەکانی شاشـە لـە جـۆری کەفائەی ڕەنگی و ڕوونی بینین و نوێ کردنەوەی شاشە (وێنەی ژمارە ٣) .

List All Modes

List of valid modes

800 by 600, High Color (16 bit), 60 Hertz
800 by 600, High Color (16 bit), 75 Hertz
800 by 600, High Color (16 bit), 85 Hertz
1024 by 768, High Color (16 bit), 60 Hertz
1024 by 768, High Color (16 bit), 70 Hertz
1024 by 768, High Color (16 bit), 75 Hertz
1024 by 768, High Color (16 bit), 85 Hertz
1024 by 768, High Color (16 bit), 100 Hertz
1024 by 768, High Color (16 bit), 130 Hertz

OK Cancel

kameran7605@yahoo.com

وێنە (٣)



٤. زیادکردنی پرێنتەری تۆڕ لە windows xp .



وێنە ((٤))

Windows xp ڕێگامـــــان دەدات بەزیادکردن و پرێنت کردن لە ڕێگای پرێنتەری تۆڕ، کە پاڵپشتی پرۆتۆکۆڵی TCP/IP دەکات، وە ناونیشانێکی IP تایبەتی بۆ دادەنرێت، بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەچینە لیستی start دوایی control panel وە دەبـــڵ کلیـــك دەکـەین لەسـەر printer وە کلیکـــی add printer دەکـــەین، لــە جــۆری پرێنتەرەکـــان Local printer دیـاری دەکـەین وە next دەکـەین، وە کلیك لـە سـەر بازنـەی (create new port)، وە لە لیستەکەدا TCP/IP Standard port هەڵدەبژێرین، دوایی ویزاردی بەرنامەکە داوای نووسینی ناونیشانی IP ی تایبەتمان لێدەکات بۆ پرێنتەرەکە، وە بەشەکانی تر تەواو دەکەین بە شێوەیەکی ئاسایی (وێنەی ژمارە ٤) .

٥. بەسەرنەچوونی کارکردنی ووشەی نهێنی بۆ هەموو بەکارهێنەران .

ئەگەر وویستمان کارکردنی ووشەی نهێنی بەسەرنەچێت بۆ گشت بەکارهێنـەران ئەوا ئەم فەرمانە دەنووسین لە پرۆمپتی دۆس (وێنەی ژمارە ٥) .



وێنە ((٥))

DOS prompt :net accountsmaxpwage:unlimited .

# هەنگاوەکانی گەڕاندنەوەی سیستەم لە بەرنامەی (Norton Ghost)

ئا: ئیسماعیل خەلیل ئاکرەیی

## زنجیرەی دووەم

لە ژمارەی پێشوو باس لە چونیەتی دروست کردنی وێنەی یەدەکمان کرد لە بەرنامەی (نۆرتۆن گۆست)، و لەم ژمارەیەدا باس لە چونیەتی گەڕاندنەوەی سیستەم (Restore) ئەکەین لە کاتی تێکچونی، یان لەکاتی دروست بوونی هەر کێشەیەك کە ببێتە هۆکار لەسەر سیستەم یان کاریگەری بکات لەسەر کارکردنی سیستەم بە شێویەکی ئاسایی . بۆیە چەند هەنگاوێك هەیە کە پێویستە بی کەین بۆ گەڕاندنەوەی سیستەم .

یەکەم جار بەرنامەکە بکەوە و بچۆ بۆ سەر ڕوبەری بەرنامەکە، لە ڕوبەری بەرنامەکە سێ هەلبژاردە هەیە ، تۆ هەلبژاردەی دووەم کە نوسراوە Restore هەلبژێرە و کلیکی لەسەر بکە بڕوانە وینەی ژمارە (١)




وینە (١)

پاشان چوار گۆشەیەك دێت تەنها کلیك لەسەر فەرمانی Next بکە بڕوانە وێنەی ژمارە (٢)




وینە (٢)




پاشان چوار گۆشەیەکی تر دێت کە داوات لێ ئەکات کە ئەو بەشە هاردە هەلبژێری کە پێشتر وێنەی یەدەکەکەت لە ناو دانابوو، تۆ کلیك بکە لەسەر فەرمانی Browse بڕوانە وێنەی ژمـارە ( ٣ )

وێنە ( ٣ )




پاشان چوار گۆشەیەك دێت لە سەرەوەی چوار گۆشەکە و لە خانەی Look in هەمان بەش لە هاردەکە هەلبژێرە کە وێنەی یەدەکەی تیدایە، ئێمە بەشی( D ) لە هاردەکە هەلدەبژێرین چونکە پێشووتر وێنەی یەدەکەکەمان لە ناو ئەم بەشە دامانابوو و لە ناو بەشەکە وێنەی یەدەکەکە دیاری بکە و لە خوارەوەی چوار گۆشەکە کلیك بکە لەسەر فەرمانی Open بڕوانە وێنـەی ژمـارە ( ٤ )

وێنە ( ٤ )




پاشان چوار گۆشەیەك دێت لە ناوی دا ئەبێ وێنەی یەدەکەکە لە خانەی imag fail name داندرابێ پاشان کلیك بکە لە سەر فەرمانی Nextبڕوانە وێنەی ژمارە ( ٥ )

وێنە ( ٥ )

پاشان چوار گۆشەیەك دێت داوات لێ ئەكات كەوا بەشە هاردەكە دیاری بكەیت كە پێشتر وێنەی یەدەكت بـوو كردبوو كـە بەشی ( C ) بـوو ئێمە بەشـەكە هەلدەبـژێرین ، و لـە ژێـر فەرمانـی Destination بەشی ( C ) هەلبژێرە و كلیك بكە لەسەر فەرمانی Next بروانە وێنەی ژمـارە ( ٦ )




وێنە ( ٦ )

پاشـان چوار گۆشـەیەكی تـر دێت خانەیەكـی بچوكـی تیدایـە لەبەرامبـەری خانەكـە نوسـراوە Overwrite Windows ئەم خانەیە دیاری بكە و كلیك بكە لەسەر فەرمانی Next بروانە وێنەی ژمارە ( ٧ )




وێنە ( ٧ )

پاشان چوار گۆشەیەكی تر دێت لە چوار گۆشـەكە تـەنها كلیك لەسـەر فـەرمانی Next بكە بروانـە وێنەی ژمارە ( ٨ )




وێنە ( ٨ )




پاشان چوار گۆشەیەکی تر دێت هەر وەك پێشوو تەنها کلیك لەسەر فەرمانی Next بکە بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٩ )

وینه (٩)




پاشان چوارگۆشەیەکی تر دێت کە پێزانینمان ئەداتێ دەربارەی قەبارە و جێگای وێنەی یەدەکەکە کە کرداری گەڕاندنەوەی بۆ دەکەین لە چوارگۆشەکە کلیك بکە سەر فەرمانی (Run Now ) بۆ ئەوەی دەست بەکرداری گەڕاندنەوەی وێنەی یەدەکەکە بکات بڕوانە وێنەی ژمارە ( ١٠ )

وینه (١٠)




و لە کۆتایی چوار گوشەکەمان بۆ دەرئەکەوێت لە چوار گۆشەکە تەنها کلیك لەسەر فەرمانی OK بکە بڕوانە وێنەی ژمارە ( ١١ )

وینه (١١)

پاشان کۆمپیوتەرەکەت لە خۆیەوە ڕیستارت ئەکات و دەست بە کرداری گەڕاندنەوەی فایلەکانی وینەی یەدەکە دەکات و کردارەکە نیزیکی ١٥ خولەك ئەخاینی بروانە وینەی ژمارە ( ١٢ )




وینە (١٢)

## ئاگـــــاداری

داوا لە هەموو خوینەرانی گۆڤارەکەمان دەکەین ئەگەر هەر بەڕیزیك پیشنیار یان تیبینی یان سەرنجیکی هەیە یـان هەر کەم و کوریەکیان بە دی کرد لە گۆڤارەکە یا ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانەی خوارەوە .

هەریمی کوردستانی عیراق / ناو بازار بەرامبەر دەرگای قەلا بالەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوینی مەلبەندی کۆمپیوتەر ئاراس یان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاریا فۆن ٢٥٢٧٠٥٤ یان مۆبایلی کۆرەك ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یـان بـە هۆی پۆستی ئەلکترۆنی

Email : aras_co_center@yahoo.com

یان :computer_magazine_2005@yahoo.com

# سیستەمی فایلاتی جۆری NTFS و FAT32

نووسینی / کامەران

ئەمەوێ سیستەمی ویندۆز بگۆڕم بۆ سیستەمی ویندۆزی ٢٠٠٠ ، ئایا لەسەرم پێویستە سیستەمی مەلەفاتی هارد دیسك بگۆڕم لە FAT32 بۆ NTFS ، ئەگەر وەڵامەکە بە بەڵێ بوو ، چۆن ئەم کارە بکەم ؟ وە ئایا جیاوازی نێوان ئەم دوو سیستەمە چی یە ؟ وە کامەیان باشترە ؟ کارەکە ئەگەڕێتەوە بۆ لای تۆ ، وە بۆ سروشتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر ، وە سیستەمی ویندۆزی ٢٠٠٠ کار ئەکات لەگەڵ هەموو جۆرەکانی سیستەمی مەلەفات ، ئەوەکو لەگەڵ سیستەمی NTFS بە تەنها ، واتە ئەتوانین ویندۆزی ٢٠٠٠ دابەزێنین لەسەر سیستەمی مەلەفاتی FAT16 و FAT32 و NTFS ، بەڵام سیستەمی ویندۆی ٩٨ و میللینیوم ناتوانن کار لەگەڵ سیستەمی مەلەفاتی NTFS بکەن . وە ئەو جیاوازی یەی هەیە لە نێوان سیستەمی NTFS و FAT ئەوەیە کەوا سیستەمی NTFS سیستەمێکی زۆر جێگیرە ، لە ڕووی کەم بوونێکی زۆری هەڵە و گرفتەکانی هارد دیسك ، وە ئاسان کارییەکی زۆرت ئەداتێ بەوەی کە دەرباز ئەبیت لە دووبارە پێکردنەوەی کۆمپیوتەر لەکاتی دابەزاندنی بەرنامەیەکی نوێ ، وە لەهەمووی گرنگتر بوونی پلەیەکی بەرزی ئەمان و ئاسایش ، چونکە لە سیستەمی NTFS هەموو مەلەفەکان تەشفیر کراون بە سیستەمی ٤٠ یاخود ٥٦ بت ، وە ئەتوانین زیادی بکەین بۆ ١٢٨ بت ، ئەویش بەهۆی دابەزاندنی بەرنامەی windows ٢٠٠٠ strong security pack ، کە ئەتوانین دای بەزێنین بە خۆڕایی لە سایتی .

http://www.microsoft.com/windows2000/downloads/recomended/encryption/default.asp

سیستەمی NTFS واتە تەکنەلۆجیای نوێی سیستەمی مەلەفات ( new technology file system ) ، وە بەکاردێت لەگەڵ سیستەمی ویندۆی NT ، وە ڕێگا ئەدات بە نووسینی ناوی درێژ بۆ مەلەف تا ٢٥٥ پیت ، وە بەو شێوە دروست کراوە کە بگەڕێتەوە حاڵەتی ئاسایی خۆی پاش ڕوودانی حاڵەتی وەستان و داڕووخان crashes ، وە لەلایەکی ترەوە سیستەمی ویندۆی NT پاڵپشتی سیستەمی مەلەفاتی جیاواز ئەکات نەوەك تەنها سیستەمی NTFS ، وە لە توانایدا هەیە کار بکات لەگەڵ سیستەمی FAT ی تایبەت بە ڤێرژنەکانی ویندۆس و دۆس ، وە هەروەها لەگەڵ سیستەمی مەلەفاتی HPFS ، وە هەروەها ئەتوانێ کاربکات لەگەڵ چەندین سیستەم لەیەك کاتدا ، کە هەر سیستەمێك دائەنرێت لەسەر بەشێك ( partition) ی تایبەت لەسەر هارد دیسك ، گەرچی تایبەتمەندی یەکانی ئاسایش لە ویندۆی NT پێویست دەکات کە کار لەسەر سیستەمی مەلەفاتی NTFS بکات . لە جیاکاری یەکی تر ئەوەیە کەوا سیستەمی NTFS ئەتوانێ کاربکات لەگەڵ هارد دیسکی قەبارە بەرز ، کە زیاتر بێت لە ١٦ تیرا بایت ، ئەویش بەهۆی بچوکی کۆمەڵەی ( cluster )ی سیستەمەکە کە دەکاتە ٥١٢ بایت ، وە کۆمەڵە بریتی یە لە یەکەیەك کە مەلەفی تیا دائەنرێت ، وە ئەویش لە چەندین بەش sectors پێکهاتووە لەسەر هارد دسك ، کە دەبێتە بچوکترین یەکەی خەزن ، کە سیستەمی کارپێکردن ئەتوانێ کاری لەگەڵ بکات . وە سیستەمی NTFS پلەیەکی بەرزی خۆڕاگری و ئیستقراری هەیە ، ئەویش بەهۆی ئەوەی دوو نوسخە ئەگرێتە خۆی لە سیستەمی خشتەی مەلەفاتی سەرەکی MFT ( master file table ) ، نمونە وەکو بنکە زانیاری یەکان ، لە کاتێکدا نوسخەی ئەسڵی ئەم سیستەمە تێکچوو بەهۆی لە کارکەوتنی بەشێك لە پارچەکانی هارد دیسك کە پێ ی ئەوترێ ( Bad sector ) ، ئەوا ئامێری کۆمپیوتەر لەپاش

restart بوونی کار بە نوسخەی دووەم دەکات ، وە بەشێوەیەکی خۆیی دەست بە دروست کردنی نوسخەیەکی نوێ دەکات ، گەرچی بەشە لەکارکەوتووەکە لەبەرچاو دەگیرێ ، ئەمەش دەبێتە هۆی پاراستنی زانیاری یەکان لە تێکچوون و لەناوچوون .

وە لەجیاکاریەکی تری سیستەمی NTFS ئەوەیە ، کە ئەتوانێ بە شێوەیەکی باشتر کار لەگەڵ هارد دیسک دا بکات ، ئەویش بەهۆی بچوکی قەبارەی کۆمەڵەی خەزن cluster کە لە ٥١٢ بایت تێپەڕ ناکات ، بە پێچەوانەی سیستەمی کۆنی FAT ، وە کۆمەڵەی خەزن قەبارەی خۆی ئەپارێزێ بە لەبەر چاوگرتنی قەبارەی بەشکراوی هارد دیسك ، بەڵام لە بەرامبەر ئەوەدا سیستەمی NTFS دەبێتە هۆی دابەزاندنی کاری یەکەی ناردن و وەرگرتنی زانیاری بۆ بەشی هارد دیسك I/O DISK ، ئەویش بە بوونی زۆری کۆمەڵەی خەزن کردن cluster ، لەبەر ئەوە زۆر لە هۆگرانی یاری ویندۆی ٢٠٠٠ دائەبەزێنن لەسەر سیستەمی مەلەفاتی FAT یان FAT32 .

وە باشیەکی تری ئەم سیستەمە ئەوەیە کە تەواو پاڵپشتی سیستەمی ( ISO Unicode ) دەکات ، کە ڕێ ئەدات بە بەکارهێنانی ١٦بت بۆ ڕەمز کردنی هەر پیتێك ، واتە بە پێچەوانەی سیستەمی ASCHII ، کە ڕێ ئەدا بە بەکارهێنانی تەنها ٨ یان ٧ بت ، بەکورتی واتە دەتوانی مەلەفێك ناوبنێ ی بە هەر زمانێك بێت ، بەبێ ئەوەی لاپەڕەی تەشفیر کراوی code page بگۆڕی لە دۆس و win٩x .

لە تایبەتمەندی یەکانی ( ISO Unicode ) ئەوەیە کەوا دوو بایت بەکاردێنێ بۆ یەك پیت نەوەکو یەك بایت ، کە ئەتوانێ چارەسەری زیاد لە ٦٥ ملیۆن پیت بکات نەوەکو ٢٥٦ پیت کە هەیە لە تەکنیکی ASCII ، ئەویش ئەبێتە هۆی توانای وەرگرتنی پیتەکانی ئەبجەدی تایبەت بە زۆربەی زمانەکانی جیهان .

لە کۆتاییدا ئەتوانین بەئاسانی سیستەمی مەلەفات لە ویندۆی ٢٠٠٠ بگۆڕین لە FAT بۆ NTFS ، بەبێ ئەوەی هیچ زانیاری یەك لەناو بچێت ، ئەویش لە ڕێگای نووسینی فەرمانی ( convert c:/fs:ntfs ) لە ویندۆی ٢٠٠٠ ، دوایی ویندۆزەکە restart بکەرەوە ، بەڵام ڕێگای پێچەوانە واتە گۆڕینی NTFS بۆFAT کە ئەتوانین پێ ی هەڵسین ، بەڵام دەبێتە هۆی لەناوچوونی گشت زانیاری یەکانی ناو هارد دسك ، لەبەرئەوە باشترە ئەم کارە بکەین بە بەکارهێنانی بەرنامەی partition magic ، کە ئەتوانێ هەردوو کارەکەمان بۆ ئەنجام بدات .





# خودی نابینا لەگەڵ ئامێری سەردەم

ڕیپۆرتاژ و فۆتۆ : ڕێناز ئەردەلان بەکر

دوا بەدوای ئـــەوەی پەیمانگایـــی نابینایانی هەولێر بەشداری کۆمپانیایەکـــی لوبنانی ناوەندی ( ڕۆشنا )ی بۆکۆمپیوتەر و ئەنتەر نێتی نابینایان کردەوە هەروەها کردنەوەی سێ خول لەلایەن مامۆستایانی پسپۆر لەم بوارە بۆفێر کردنی نابینایان بۆ زانستی کۆمپیوتەر و ئەنتەر نێت بە پێویستمان زانی لەنزیکەوە لەزاری بەشداربوانی خولەکە بزانین و پرسیار بکەین کە ئایا ئەم خولە تا چەند سود مەندە بۆیان ؟ تا چ ڕادەیەك کار ئاسانی بۆ خودی نا بینا کردوە ئایا هیچ گیرو گرفتێکی بۆ چارەسەر کردوون ؟ ئەوانیش لەوەڵام دا گوتیان :



**سـەرەتا مامۆسـتا مەحـەمەد سەرپەرشتیاری گۆڤاری هاوبەش گوتی :**

هەڵبەتە ئەو ناوەندەی کەلێرە دامەزراوە بێگومان یەکێکە لە هەرە ناوەندە پێشکەوتوەکان نەك هەر لەسەرتاسەری عێراق بەڵکو لەسەر ئاستی ڕۆژهەڵاتـــی نـــاوەڕاست کەپرۆژەیەکی یەکجار گەورەیـــە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان دایمەزراندوە دەست خۆشیان لێ دەکەین . ئەو سودەیی کەئێمەی نابینا لەم خولە بینیومانە سودی یەکجار زۆرە ، ئێمە وەك نابینا دەتوانین وەك خەڵکی ئاسایی سود لەکۆمپیوتەر ببینین بۆ نمونە من نوسەر م لەگۆڤار کاری نوسین دەکەم پێویستیم بەنووسین هەیە ، بەر لەدابین کردنی ئەم ناوەندە دەبوایە کەسێك بابەتەکانی بۆ بنوسیبامەوە بەڵام ئێستا لەسایەی ئەم کۆمپیوتەرە ئەو پێویستیەم نەماوە کە ئەمە سودێکی گەورەی هەیە بۆ ئێمەی نابینا ، سەبارەت بە تۆڕی ئەنتەر نێتیش ٪٦٠ پێداویستیەکانی ئێمەی پرکردۆتەوە من خۆم تاکە سەرچاوەم بۆزانیاریەکان ئەنتەرنێتە کە بەئاسانی بۆ ماوەیەکی کەم دەتوانم زانیاریەکانم دەست بکەوێت . هەروەها دەتوانم لەڕێگای ئیمێلەوە وەك نابینایەکی کورد بەشداری لە هەندێ کۆڕو سیمینارات بکەم بۆیە ئەم ناوەندە سودێکی زۆر گەورەی بەئێمەی نابینا گەیاندوە هیوای پێشکەوتن و بەردەوامی بۆ دەخوازم .



**پشتیوان عزەدین سەبارەت بە سودی ئەم ناوەندە دەڵێت :**

کردنەوەی ئەم خولە بێ وێنەیە لەهەموو عێراقدا . نابینایان زۆر سودیان لێ بینیوە بەردەوام خولی لەم جۆرەش دەکرێتەوە من یەکێکم لەبەشدار بوانی ئەم خولە ، کە وەك نابینایەك بۆ یەکەم جارمە کۆمپیوتەر بەکار بهێنم بتوانم لە کۆمپیوتەر شارەزا بم ،بچمە ناو تۆڕەکانی ئەنتەر نێت بۆیەکەم جار خۆم توانیم ئیمێلی خۆم دروست بکەم . من وەك خودی نابینا خۆم زۆر سودم بینیوە دەتوانم بەئاسانی بچمە ناو تۆڕی ئەنتەر نێت چیم بوێ بیکەمەوەو بیخوێنمەوە سودی تەواوی لێ وەربگرم وەك کەسێکی ئاسایی . تێبینیشم ئەوەیە من خۆم لەکەرکوکەوە بەشداریم کردوە ، نابینایانی شارەکانی تر بێ بەشن لەم خولە، بۆیە داواکارم ئەگەر بەوشێوەیەو قەبارەیەش نەبێ بەلاّم لەم جۆرە خولانە لەشارەکانی تری کوردستان بەتایبەتی شاری کەرکووك بکرێتەوە بۆ ئەوەی نابینایانی ئەم شارانەش سودمەند بن .



**لەکۆتایدا مامۆستا هێمن نەوزاد گووتی :**

من لە خولی یەکەمدا بەشدار بووم زۆر سودم بینیوە لەزۆر لایەنەوە. وەك خودی نابینا من نووسەرم پێشتر دەبوایە یەکێك کاری نوسینم بۆ بکات بەلاّم ئێستا پێویستم پێ نیە بۆ خۆم دەنوسم هەروەها ئیمێلی خۆم هەیە دەتوانم زۆر بەئاسانی بەدەنگ و ڕەنگ قسە لەگەڵ دەرەوە بکەم دەتوانـــم زۆر بەئاسانــــی سایتەکانـــی ئەنتەرنێــت بکەمـــــەوە زانیاری وەرگرین لەلایەنی ئەدەبی وزانستی هیوادارم ئەم خولەش بەردەوام بێــت خولی تریـــش بکرێتەوە جۆزەکەمان بکرێتە کوردی بۆئەوەی بتوانین سایتە کوردیەکان بکەینەوە . تێبینیەکیشم هەیە ئەویش ئەوەیە کەکاتێك کۆمپیوتەر ەکانمان تێك دەچێت ئەندازیاری تایبەتمەند و شارەزامان نیە لەو بوارە تایبەتمەند بێت بۆیە هیوادارم ئەوەش چارەسەر بکرێ .هیوای سەر کەوتنیش بۆ ئەم ناوەندە دەخوازم .



**ماموٚستا عومەر حەسەن بەم شێوەیە باسی لە سودی خولەکە کرد :**

لەیەکەم خولی ناوەندی ڕۆشنا بەشداریم کرد لەگەڵ کۆمەڵی لەبرادەرانی تر، دەتوانم بڵیم کۆمپیوتەری تایبەت بەنابینا یان ١٠٠٪ سەر کەوتوە لەبەر ئەوەی نابینا دەتوانێت بەهۆی ئەم کۆمپیوتەرە بنوسێت و بخوێنێتەوە ،پێشتر نابینایان گرفتی نوسین و خوێندنەوەیان هەبوو بەڵام بەهۆی ئەم ناوەندە ئەم گرفتەمان نەماوە .من ئێستا خۆم لەئەنتـــەر نێت یەکێـــك لـــە ڕۆژنامەکانی عێراقم کردوٚتەوە کە ناوی (زەمان ) ە دەیخوێنمەوە ئیمە جاران ئاگامان لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان نەبوو دەبوایە بەکەسێك بڵێن تاکو بۆمان بخوێنێتەوە . من و کۆمەڵێك لەبرادەرانی تر نوسەرین و لەگۆڤار وڕۆژنامەکان بابەت دەنوسین ئێستا خۆمان بەهۆی کۆمپیوتەر دەینوسینەوە ڕۆژی دواتر بە( فلاش ) بۆیان دەنێرم . بەگشتی ئەم ناوەندە زۆر سەرکەوتوە تەنیا ئەوە نەبێت کەزمانی کوردی نیە زۆربەی نابینایان زمانی عەرەبی بەچاکی نازانن بۆیە ئەگەر سیستەمەکە بکرێتە کوردی ئەوا گرفتێکی زۆر بۆ نابینایان چارەسەر دەکات ، دەشمەوێ لێرەوە سوپاسی حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەم کە هەر شتێك پێویستی بەیارمەتی حکومەت هەبێت کەم تەرخەمی نەکردوە .هیوا زیاتر پێشکەوتن بۆ ناوەندی ڕۆشنا دەخوازم هیوادارم ئەو نابینایانەی کە لە کۆمپیوتەر شارەزانین بەشداری ئەم خولانە بکەن بە بۆچونی من نابینا ئەوە نیە کە چاوی نەبینێ بەڵکو ئەوەیە کە لە کۆمپیوتەر و ئەنتەر نێت نەزانێت ،چونکە گەر کۆمپیوتەر جارێك بۆ چاو ساغ گرنگ بێت دەجار بۆنابینا گرنگە بۆیە هیوای پێشکەوتن بۆ ئەم ناوەندە دەخوازم .











# ڕێگـــایەك بـــۆ
# قفڵ دانی هەموو پۆرتەکان لەناو ئامێرەکەت

ئـا / بـاوکـی مـاریـا
Kameran7605@yahoo.com

بەڕێـزان زۆر لــەئێمە لەکەسی هاکــەر دەترسێین ، لــە تێکدانی ئامێرەکانمان ، گـەرچی بەرنامەکانی دیواری ئـاگرین ( Firewall) ئـەم کێـشەیەمان بـۆ چارەسـەر دەکـات ، ئەگـەر بەشـێوەیەکی دروسـت بـەکاری بێـنین ، بـەلأم ئەگـەر بەشێوەیەکی دروست بەکار نەهات ، ئەوا هەبوونەکەی وەکو نەبوونی وایە . ئێمە ئەم جارە هەڵدەسین بە باس کردنی ڕێگایەك بۆ قفڵدانی هەموو ئەو پۆرتانەی کەهەن لەنێو ئامێرەکەت ، کە هاکەرەکان سوودی لێ وەردەگرن بۆ دزە کردنە نێو ئامێرەکەت وە تێکدانی .


وینە (١)

بڕۆ بۆ لیستی start دوایی run وە دەنووسین command.com وە ok دەکەین وەك وێنەی ژمارە ١


وینە (٢)

شاشەیەکمان بۆ دەکرێتەوە وە تیای دەنووســین host ping وە enter دەکەین وەك وێنەی ژمارە ٢

پاش چاوەڕێ کردن دەنووسین ping port وە enter دەکەین وەك وێنەی ژمارە ٣




وێنە (٣)

دووبارە پاش چاوەڕێ کردن دەنووسین ping port1027 وە enterدەکەین وەك وێنەی ژمارە ٤




وێنە (٤)

وە پاش چاوەڕوان کردن دەنووسینping port80 وە enterدەکەین وەك وێنەی ژمارە ٥




وە دوایی دەنووسین ping proxy وە enterدەکەین وەك وێنەی ژمارە ٦



وە لە دواییدا دەنووسین ping port وە enter دەکەین وەك وێنەی ژمارە ٧.




ئێستا کارەکە تەواو بوو ، کە هەڵساین بە قفڵدانی پۆرتەکان لە برۆکسی تایبەت بە ئامێرەکەت ، وە بووە هۆی قەدەغەکردنی چوونە ژوورەوەی هاکەرەکان لەم بۆشاییەوە بۆ ناو ئامێرەکەت کە زۆر کەس هەن دەتوانن لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە بچنە ناو ئامێرەکەتانەوە و دەست کاری زانیاریەکانت بکەن بەڵام وەك لە پێشوودا باسمان کرد ئەو هەنگاوانە بنێ تا دور بیت لە چەتەکانی ئەنتەرنێت و کەس نەتوانێت زانیاریەکانت ببات .

## ئاگــــــــــاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤارەکەمان تکایە لە کـاتی وەرگێرانـی هـەر بابەتێـك ئاماژە بکەن بە ناوتیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە ئەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەر پرسیار نین لـە هیـچ لێپرسینەوەیەك .

# مەبەستمان لە WAP چیە

بێستون عمر

زۆربەمان ئەم زاراوەیەمان بیستووەو بینیوە ئێمە لەم بابەتەدا بە تەواوەتی شیکاری ئەم زاراوەیە دەکەین و دێین ڕوونی دەکەینەوە کە مەبەست لە واپ چیە واپ ئەرك و فەرمانی چیە ئەم زاراوەیە لەچیەوە هاتووە مێژووی دروست بوونی ئەگەڕێتەوە بۆ کوێ و کەی چون کار دەکات بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە لە گەڵم بن با بزانین مەبەستمان لە واپ چیە .

واپ کە کورتکراوەی

(Wireless Application Protocol) (WAP) واتا پرۆتۆکۆلی جێبەجێکاریە بێ تەلەکان وە پێوەرێکە لەرێگایەوە زانیاریەکان دەگوازرێنەوە وە لەرێگای ئامێرە بێتەلەکان مەبەست وایەر لێس نیشان دەدرێن وە ئەم پرۆتۆکۆلە زۆر لە شێوەی پرۆتۆکۆلی ئەنتەرنێت دەچێت .بەڵام واپ تایبەت کراوە بۆ وایەر لێس وە بەوە جیادەکرێتەوە. کۆمپانیای (واپ فۆرم ) ، پەرەی زیاتری بەم بەرنامەیە داوە وە خۆشی خاوەنی ئەم تەقەنیە پێشکەوتوەیە. نۆکیا ، مۆتۆرۆلا ، جگە لەمانەش لە کۆمپانیا گەورەکانی جیهانن کە پەرەیان بەم پرۆتۆکۆلە داوەو پێشیان خستووە . بەڵام هەمویان یەك مەبەستیان هەیە ئەویش وە گەرخستنی ئەنتەرنێتە لەرێگای مۆبایلەوە . ئەنتەرنێت وەکو لای هەموومان ئاشکرایە بەشێکی گرنگە بریتیە لە زانیاری و وە چەند خزمەتگوزاری تر . وە ئەنتەرنێت لەم سەردەمەدا گرنگیەکی تایبەتی هەیە لەهەمان کاتدا بەکارهێنەران و داواکاری بەکارهێنانی رۆژ بە رۆژ زیاد دەبێت . بەڵام لێرەدا لەبەر زۆری داواکارا ولەبەر زۆری بەکارهێنەران و لەبەر ئەوەش کە خەڵك حەز دەکات بە ئارەزووی خۆی لەهەر شوێنێك بێت ئەنتەرنێت بەکاربهێنێت بەتایبەت لە شوێنە قەرەباڵغەکان وەکو فرۆکەخانەو ناو داموو دەزگا حکومیەکان و وەزۆر شوێنی تر تەنانەت گەشت و لەکاتی سەفەر کردن . لەبەر ئەوەی واپ چونکە پرۆتۆکۆلێکی سەرکەوتووە لە گواستنەوەو پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکانی ئەنتەرنێت لە رێگای مۆبایلەوە ، وە پرۆتۆکۆلێکی زۆر سەرکەوتوە لە گەیاندنی خزمەتگوزاریەکانی ئەنتەرنێت لەهەمان کاتدا ئەبێت ئەوە بزانین کە واپ تایبەتمەندیەکانی وەکو پەرە هەڵدەرەوەیەکی تر نیە چونکە لە شاشەیەکی بچووکی مۆبایلەوە نیشان دەدرێت و تایبەت دروست کراوە بۆ مۆبایل ، بەڵام توانای کردنەوەی هەموو پەرەکانی وێبی هەیە وە هاوبەشە لەگەڵ هەموو سیستەمەکانی ئەنتەرنێت . بۆ ئاسانکاری گەیاندنی ئەنتەرنێت لە واپدا بەچەند هەنگاوێکدا دەڕوات :

١ - لە سەرەتادا لە رێگای نامەیەکی SMS تایبەت بە تەلەفۆنی واپ کە هەڵگری پەری WML (Wireless Markup Language) لە رێگای ئەم نامەیەوە کە زانیاریە پێویستەکانی تایبەت بە داواکردن و گەیاندنی هێلی ئەنتەرنێتی تێدایە دەگاتە SMSC (Short Message Service Center) کە فەرمانی گەیاندنی زانیاریە بۆ پرۆکسی واپ کە ئەویش هەڵدەستێت بە گەیاندنی زانیاری داواکراو لە ئەنتەرنێت کە لەشێوەی زمانی HTML وە دەیگۆرێت بۆ WML کە مۆبایلەکە ئەم زمانە دەخوێنێتەوە .

٢ - لە رێگای زانیاریەکانی هێلی واپ هەڵدەستێت بە ناردنی ئەو زانیاریانە کە لەسەر شێوەی زمانی WML وە دەینێرێت بۆ DCS (Digital Circuit Switch) ئەم بەشەش ڕاستەوخۆ کار دەکات لەگەڵ پرۆکسی واپ وە گۆرینی زمانەکە بۆ زمانی واپ و ناردنەوەی بۆ مۆبایلەکە بەم شێوەیە کرداری ناردن و داواکاری و بەکارهێنانی ئەنتەرنێت لە مۆبایل لە رێگای واپ کاردەکات .

# دروستكردنی ماڵپەڕەكانی ئەنتەرنێت بە بەرنامەی Front Paege زنجیرەی (١)

ئا: پێشرەو حەیدەر

وەك دەزانین ماڵپەرەكانی ئەنتەرنێت شتێكی زۆرئالۆزە كەیەك بەدوای یەك دەبنەوەو هەروەها ئایكۆنەكانی زۆربەیان بەماوس دەجولێن و هەروەها هەموو دروستكراوەكانیش بەشتێك بەستراون واتا هەرشتێك كلیك بكەیت تایبەتە بەشتێكی تر هەروەها ماڵپەری ئەنتەرنێت لەچەند شتێك پێكهاتوە وەك فلاش كەزۆربەی ڤیدیۆكان بە بەرنامەی فلاش دروست دەكرێت لەبەرئەوەی قەبارەی زۆر بچووكە بۆیە لەماڵپەرەكان فلاش زۆربەكاردێت هەروەها ئەو پەرەی كە گشت وێنەكان و نوسینەكان و ئایكۆنو ڤیدیۆكانی لەخۆی گرتوە ئەوە بە بەرنامەی Front Paege دروستكراوە ئەم بەرنامەیە خۆی دەتوانێت لاپەرە دروست بكات و هەروەها دەتوانێت هەروێنەیەك بكاتە ماڵپەر هەروەها دەتوانی هەمووشتەكانی وەكو Search سێرچ و Dowan Lowad داونلۆود و شتەكانی تر دروست بكات بۆیە تا ئێستا زانایان كارەكانی ئەنتەرنێت هەمووی بە بەرنامەی Front Paege دروست دەكەن كارپێكردنی ئەو بەرنامەیە برێك ئالۆزە بۆیە داواتان لێدەكەم لەكاتی باسكردنی ئەو بەرنامەیە برێك ووردبین ئەو كاتە من دڵنیام ئێوە دەتوانن بە ئاسانی ماڵپەرێك بۆخۆتان دروست بكەن سەرەتا بەرنامەكە دادەبەزێنیت لەسەركۆمپیوتەر ئاگاداربن بەرنامەكە لەگەڵ بەرنامەی ئۆفیس دایە واتا دەتوانیت بەرنامەكە لەگەڵ ئۆفیس بەیەكەوە دابەزێنیت بۆسەر كۆمپیوتەر ئینجا دێیت بەرنامەكە دەكەیتەوە سەیری وێنە ١ بكە




وینە (١)



بەرنامەکە بەم شێوەیە پاشان یەکەم هەنگاو دێیت Fileدەکەیتەوە لەوێوەش New کلیك دەکەیت بەم شێوەیە وێنە٢

وینە (٢)



دواترسەیری لای راستی بەرنامەکە بکە لە خوارەوە چەند پەرێکی حازر دروستکراوە تۆ بەگوێرەی ئەو پەرەی کە پێویستتە یەکیان هەڵدەبژێریت کلیکی لەسەر دەکەیت ئەوجارە سەیری پەرە بەتاڵەکە بکە چەند هێڵێك دروست بووە پاش هەڵبژاردنی پەرە دروستکراوەکان وێنە٣

وینە (٣)



پاشـــان لـــە ئایکـــۆنەکـــانی ســــــەرەوە Wep Comment هەڵدەبژێریت ئاگاداربە ئەم ئایکۆنە زۆربەی کارەکانی ئەوبەرنامەیە ئەنجام دەدات هەرکە کلیکت لەسەرکرد لیستێك دەبێتەوە سەیری وێنە ٤ بکە

وینە (٤)



هەرلەم لیستەدا لە خوارەوە Finish هەیە یەکجار بـــەماوس کلیکـــی لەســـەردەکەیت لیـــستێکی تردەبێتەوە ئەمە یەکەم کردارە لەماڵپەر کە بریتیە لـە نووسـینی سـەرەکی واتـا تـۆ ئەگـەر بتـەوێ ماڵپـەرێك دروسـتبکەیت دەبێـت سـەرەتا یەکـەم نووسـینت بـەخێرهاتنی ئـەو هاورێیانەیـە کـە سەردانی ئەوماڵپەڕە دەکەن تۆش یەکەم نووسینت لەرێگای ئەم لیستەوەیە بۆشایی ناوەراستی ئەم لیستە نوسینی سەرەکی خۆت دەنوسیت و پاشان ئۆکەی دەکەیت وێنە ٥

وینە (٥)



هـەروەها کـرداری دووەم دانـانی Button ە واتـا زیـاکردنی ئـایکۆن دیـسان دێیـت لەســەرەوەی بەرنامەکـــە Wep Comment هەڵدەبژێریـــت هەرلـەم لیستە بـەڵام ئـەو جـارە نوسـینی دووەم هەڵدەبژێریت کە بریتیە لە Interactive Button وێنە٦

وینە (٦)



پاشـــان لـــەم لیـــستە لـــەخوارەوە Finish هەڵدەبـژێریت ئینجا دەچیتە لیستێکی تـر کـە لیـستی ئایکۆنەکانـە لـەم لیـستەدا دەتوانیـت ئایکۆنێـك بەکـەیفی خـۆت هەڵبـژێریت هەروەهـا دەتوانیت نوسینی ئایکۆنەکە بەدڵی خۆت بگۆریت وێنە ٧

وینە (٧)



لە بۆشایی خوارەوە نوسینەکەت دەنوسی ئینجا ئۆکەی دەکەیت پاش دروستکردنی هەرشتێك لەبەرنامەی فرۆنت پەیج لەخوارەوەی بەرنامەکە لەلای چەپ Prevewe هەیە بەکلیك کردن لەسەر prevewe شتەکانت پیٚ نیشان دەدات کە چۆن دەبێت لە ماڵپەری ئەنتەرنێت بەم شێوەیە وێنە ٨

وێنە ( ٨ )



کرداری دووەم لە بەرنامەی فرۆنت پەیج بریتیە لە دەست بەکاربوون واتا فعال بوون واتا تۆ ئەو ئایکۆنەی دروستت کردوە بەناوی وێنەکان دەبێت لە کاتی کلیك کردن وێنەکان ببنەوە ئێستا لەسەر ئەو ئایکۆنەی دروستت کرد بەلای ڕاست کلیك بکە لیستێك لەسەری دەبێتەوە لە کۆتایی لیستەکە Hyperlink کلیك دەکەیت لیستێك دەبێتەوە وێنە ٩

وێنە ( ٩ )



ئینجا ئەو وێنەی کە دەتەویٚ لەکاتی کلیك کردن ببێتەوە یەك کلیکی لەسەردەکەیت پاشان ئۆکەی دەکەیت وێنە ١٠

وێنە ( ١٠ )

ئێستا وەرە preveweکلیك بکە پاشان کلیکێك لەسەر ئایکۆنی وێنەکان بکە دەبینیت ئەو وێنەیەی داتناوە بۆتەوە وێنە ١١و ١٢ پاشان هەمووکارەکان لەڕێگای فایل لەوێوەش سێڤ ئاس هەڵدەگرین بەرنامەی فرۆنت پەیج زۆر کاریتر دەکات لەداهاتوو بەدرێژی باسی لێوە دەکەین



وینە (١١)



وینە (١٢)

# هەموو شتێك دەربارەی ڤایرۆس

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە / زەهرە حسن محمد
سەرچاوە : البوابة العربية

لەوانەیـە ڕۆژێـك تێنەپـەڕێ بـێ پەیـدابوونی ڤایرۆسـێکی نـوێ بـۆ ئامێرەکـانی کومپیوتـەر ، لـە بـەینی نوێتریـن ڤـــایرۆس و ڤایرۆســـی شـــاردراوە کـــە لـــە نامـــە ئەلکترونیەکاندا (E-mail ) پەیدادەبێت کە وا لە ڕێگای ئیمایلـەوە نامـەی جـۆری ڤیـدیو کـە چـەند دیمـەنێك لـە کردەوەی تەقینـەوەکانی لەندنی پیـشان دەدات ، بەلآم لە دوایـشدا دەبێتـە هـۆی تێکـچوونی ئامێرەکـە شـێوانی سیستەم کە بەکارهێنەر نەتوانێ کونترۆلی سیستەم بکات چـوونکە دەکەوێتـە ژێـڕ کونتروڵـی دروسـت کـەری ڤایروسـەکە . لەگـەل زیـاد بوونـی مەترسـی ڤایروسـی کومپیوتەر ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر پێویستیمان بە زانینـی سروشتی ڤایرۆسی کومپیوتەر و چۆنێتی ئیش کردنیان وە چۆنێتی لابردنیان وقەلاچۆکرنیان ، ئێستاش گرنتریـن خـالێ دەربـارەی ڤـایرۆس دەسـت نیـشان دەکـەین . لـە پێشەوە با بزانین ڤایرۆسـی کومپیوتـەر چیە ؟ ڤایرۆسی کۆمپیوتەر زیانێکی زۆر بە سیستەمی ئیشکردن دەگەێنێ ، ڤایروی کۆمپیوتەر بریتییە لە بەرنامەیەك تصمیم کراوە بۆ ئەوەی دەست کاری ئیش و کارەکانی کومپیوتەر بکات ، بە کوپیی کردنی یان خراپ کردنـی یـان لابردنـی ئـەو بیاناتانەی (Data ) کە لەسەر کومپیوتەرەکە تۆمار کراون ، یان کوپی کردنـی خـۆی بۆ ئامێری کومپیوتـەری تر لە ڕێـی ئەنتەرنێتـەوە ، ئـەم کارانـەش زۆر جار دەبێتـە هـۆی کەمبوونی توانای کومپیوتەرەکە وە ئیش کردنی چەندەها کێشەی تر . هەر چۆن جیاوازی ئەو ڤایرۆسانە هەیە کە تووشی ئادەمیزاد دەبن ، بەو شێوەیە جیاوازی هەیـە لە ڤایروسـەکانی کومپیوتـەر لـە شـتێکی ئاسـایەوە بـۆ بـۆ شتێکی زۆر زەرەرمەند ، ئەم ڤایرۆسانە لە شێوازی زۆر و جیاوازدا دەبیـنرێ ، بـەلآم لەگـەلێ هەنـدێ هۆشیاریەوە و زانـــین دەربـــارەی کومپیوتـــەر دەتـــوانین ئامێرەکانمـــان بپارێزین لـە تـووش بوون بـە ڤایرۆس . هەنـدێ کـەس وا تێـدەگات کـە ڤـایرۆس توانـای ئـەوەی هەیـە زیـان بـە پێکهاتـەکانی کومپیۆتـەر بگـەێنێ وەك شاشـە یـان هـارد دیـسك ، بـەلآم ئەمانـە لـە تەواویـەوە دوورن ، وە هـەر ئاگاداریەك دەربارەی زیانی ڤـایرۆس لەسـەر پێکهاتەکانی کومپیۆتەر ڕاست نییە . بەلآم ڤایرۆس چۆن ئیش ئەکا ؟ ئـەو نامـە ئەلکترونیانـەی کـە ڤایروسـی خۆشەویـستی پێوەیـە ڤایروسـی کومپیوتـەری سـەرەتایی بـوون پـشت دەبەسـتێ بـە ئیهمـالی بەکارهێنـەر بـۆ گواسـتنەوەی لـە کۆمپیوتـەرێك بـۆ کومپیۆتـەرێکی تـر ، بـەلآم جـۆرە پێـشکەوتووەکانی ڤـایروس وەکـو بەرنامـە کرمییـەکان توانـای خـۆ کوپـی کـردن و گواسـتنەوەیان هەیـە بـۆ کومپیوتـەرەکانی دی بە شێوەی خۆیـی (**ذاتي** ) پـشت دەبەستێ بە هەندێ بەرنامەی وەك بەرنامەکانی پێشوازی و نـاردنی نامـەی ئـەلکترونی (بریـد الکترونـی ) هەنـدی ڤایروس لە جۆری ئەسپی بەرەلآ (**حصان طراودة**) شێوەی بەرنامـە بـە سـوود دەنوێـنێ بـۆ ئـەوەی بەکارهێنـەر بخەڵـەتێنێ وەدەست بـە داگرتـنی بەرنامەکـە دەکـات بـۆ کومپیوتەرەکـەی ، هـەروەها هەنـدێ لـەو ڤایرۆسـانە بـە ڕاستی ئەو کارە بە سوودەمان بۆ دەکەن ئـەوەی تەوەقعی دەکـەین دەیکـا بـەلآم لەبنـەوە ئیـشی تێکـدەری خۆشـی دەکات وێرانکاری لە سیستەمەکە دروست دەکات ، لێرەدا پێویـستە بەکارهێنـەر زانـستێکی تـەواوی دەربـارەی جۆرەکانی ڤایرۆس ببێت و چۆنێتی ئیش کردنیان ، بەلآم لەمە گرنگتر ئەوەیە چۆن سیستەمی ئیشکردن بپارێزێ ئامێرو بەرنامـەکانی قەلآچۆکردنی ڤایرۆس بەکار بێنێت متابەعەی جۆرە نوێ کانی ڤایروس ببێت هەروەها ئاگادار مالپەرەکانی ئەنترنیت بێت کاتێ کە بەکاری دێنێ یان ئەو کاتەی کە بەرنامەیەك دادەبەزێنێ بۆ سەر کومپیوتەرەکەی یان لەکاتی پێشوازی نامە ئەلکترونیەکان . لە کاتێکشدا کە کومپیوتەرەکە تووشـی ڤایرۆس بێت لێرەدا چۆنێتی تووش بوونی یان جۆری ڤایرۆسکە ڕۆڵی سەرەکی دەبینن بۆ لابردنی لەسەر ئامێرەکەت.

# چۆن ڤایرۆسی ناو وێنەکان دەدۆزینەوە

ئا: باکۆئومێد

هەر لەم گۆڤارەوە زۆر لەسەر بابەتی ڤایرۆس و دژە ڤایرۆسەکان نووسراوە لەڕاستیدا چەند باس بکرێت کەمە چونکە ئێستا وە رۆژ بە رۆژ هاکەرو تێکدەرانی کۆمپیوتەرو و ئەنتەرنێت زیادیان کردووە هاوشان لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمپیوتەرو و ئەنتەرنێت تا کار گەیشتە ئەو ڕادەی هەندێك لە خەڵکی کوردستان وەکو هاکەرو وەکو تێکدەر لە سەر ئەنتەرنێت لە ناو ژوورەکانی چاتدا وێنە دەنێرن و لە دوای ڕیستارت کردن کۆمپیوتەرەکە توشی ڤایرۆس و توشی ترۆجان دەکەن جا بۆیە من ئەم بابەتەم بە گرنگم زانیوەو دەمەوێت هەموو بەکارهێنەرێك ئاگاداری بێت .

لە ڕاستیدا ئەم کردارە تەنها بۆ ڤایرۆسی وێنە نیە بەڵکو بۆ هەموو ئەو ڤایرۆسانەیەی کە پاشبەندی هەڵخەڵەتێنەرو پاشبەندی وێنەیی خەزن دەکرێن . بۆ ئەم کردارە پێویستە لە هەنگاوی یەکەم بچینە سەر کۆنترۆل پەناڵ لەوێش لە لیستی منیو بار کلیك لەسەر (Tool) دەکەین ئینجا کلیك لەسەر فۆڵدەر ئۆپشن دەکەین (Folder Options) بڕوانە وێنەی (١)

وێنە (١)

پاشان بۆکسێك دەکرێتەوە ئێمە کلیك لەسەر بەشی (View) دەکەین . بڕوانە وێنەی (٢) پاشان ئاراستەی نیشان کردن لەسەر ئەم ڕستەیە لادەبەین (Hide extensions for known file types ) . بەڵام پێش ئەم کردارە پێویستە نـاوی فایلەکە بگۆڕین وە لەگەڵی پاشبەندەکـە بنوسین بۆ نموونە ئەگەر فایلەکە وێنەیـی بوو ئـەوا (TAZA.jpg) پاشان ئەم کردارەی سەرەوە لە کۆنترۆل پەنەڵ جێ بە جێ دەکەین . ئینجا ئەگەر فایلەکە ڤایرۆس بوو ئەوا یەکسەر پاشبەندەکەی خۆی دەردەکەوێت . بۆ زیاتر ڕونکردنەوە ڤایرۆسی خۆشەویستی ( ڤایروس حب ) بە شێوەی دەقە بەم شێوەیە خۆی نیشان دەدات ( shatrton.txt) . بەڵام دوای ئەم کردارە واتا دوای کەشف بون دەبینی پاشبەندە ڕاستیەکەی خۆی بەم شێوەیە (shatrton.txt.vbs) هەر پاش بەندێك بەم شێوە بوو واتا فایلی ڤیژوەل بەیسکە .وە بەم شێوەیە دروست کراوە وە مانای بونی ڤایرۆسە .




وێنە (٢)

# چۆن خەتی نوسین

## لە شاشەی LCD یان لاپتۆپ جوانتر دەکەین

ئا: حسن عمر

جوانکردنی فۆنتی نوسینی سەر کۆمپیوتەر و سەر پەڕەکانی ئەنتەرنێت لە ڕێگای ClearType کە ئەم تایبەتمەندیە تەنها لە ویندۆزی ئێکس پی هەیە مەبەستمان لە گۆڕین و جوانکردنی فۆنتی کۆمپیوتەر بۆ ڕووبەری ئەو شاشەنەی کەوا فلاتن یان کۆمپیوتەری لاپتۆپە وە هەروەها ئەم گۆرانکاریە بە ڕاشکاوی لەسەر شاشەی کۆمپیوتەری ئاسایی دیار دەکەوێت . بۆ جێبەجێکردنی ئەم کردارە پێویستە لە کۆنترۆل پەنەڵەوە بچینە سەر (Display) پاشان کلیك لەسەر بەشی (Apperance) بڕوانە وێنەی (١)



وێنە (١)

پاشان کلیك لەسەر (Effect) دەکەین . وەك لەوێنەی (١) دیارە پاشان بۆکسێك دەکرێتەوە بڕوانە وێنەی (٢) . وەك لە وێنەی (٢) دیارە بۆ گۆڕینی شێوەی فۆنتەکە لە شێوەی ستاندەرد بۆ (ClearType) ئەویش بە کلیك کردن لەسەر بەشی گۆڕینی فۆنت . دواتر کلیك لەسەر (OK) دەکەین دەبینین ڕووکاری فۆنتی سەر کۆمپیوتەر بە تەواوی گۆڕاوە .



وێنە (٢)

# چەند فەرمانێکی گرنگ لە پرێنتەر

## بەشی یەکەم

ئەژین بابکر

چاپ کردن یان پرێنت کردنی هەر فایلێك لە ڕێگای ئامێرێکەوە دەبێت بە پرێنتەر ناسراوەو یەکێکە لە و ئامێرانەی بە دەرکردنی زانیاریەکانی کۆمپیوتەر دادەنرێت واتا دەچێتە خانەی ئامێرەکانی (Out put) زۆرترین بەکارهێنانی ئەم ئامێرە ڕاکێشان و دەرکردنی پەرەکانی وۆردە بەڵام دوای پەیدابوونی پرێنتەری ڕەنگاو ڕەنگ وێنەو فایلی تری گرنگ لە ڕێگای پرێنتەرەوە پرێنت دەکران ئینجا زۆری داوا و زۆری پێویستی سەر پرێنتەر وای لە ناوەندەکانی دروست کردنی پرێنتەر کرد کەوا چەندان جۆری پرێنتەری ڕەش و سپی و ڕەنگاو ڕەنگ دروست بکەن بەڵام هەموویان لە تایبەتمەندیەکانی پرێنت کردن وەك یەکن بۆ هەریەکەشیان خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندین یەکێك لە تایبەتمەندیە گرنگەکان بریتیە لە پرێنت کردنی چەند پەرێك لەسەر یەك لاپەرە مەبەست ئێمە گەر بمانەوێت پێش پرێنت کردنی هەشت لاپەرە کە ئامادەمان کردووە بزانین چۆنن بۆیە بۆ ئەوەی لەسەر هەشت لاپەرەی پرێنت نەکرێن بە هەنگاوێکی بچووك لە پرێنتەر دەتوانین هەشت لاپەرە وە دەتوانین شانزە لاپەڕە لەسەر یەك ڕووی پەرێك پرێنت بکەین ئەم کردارەش یارمەتی دەرێکی باشەو وە خزمەت گوزاریەکی زۆر بەسودە لە سەر تایبەتمەندیەکانی پرێنتەر هەیە بۆ جێبەجێکردنی ئەم کردارە پێویستە لەسەرەتادا لەڕێگای فایل (File) کلیك لەسەر پرێنت بکەین بڕوانە وێنەی (١).




وێنە (١)

یان بە ڕاستەوخۆ بە داگرتنی (Ctrl+P) یەکسەر دەچینە سەر بۆکسی پرینتەر بڕوانە وێنەی (٢) .



وێنە (٢)

پاشان لەبەشی ڕاستی ئەم بۆکسە لە فەرمانی (Page per sheetp) بە پێی پێویستی خۆمان ژمارەی ئەو پەرانە زیاد دەکەین کە پرینت بکرێن لەسەر یەک لاپەرە لە ١ لاپەرەوە تا دەگاتە ١٦ لاپەرە . بڕوانە وێنەی (٣)



وێنە (٣)

کە ئاماژە بە ژمارەی پەرەکان دەکات دواتر وەك لەوێنەی (٢) دیارە کلیك لەسەر (OK) دەکەین دەبینین تەواوی پەرەکان بەشێوەیەکی بچوك لەسەر ڕووی یەك لاپەرە پرینت بونە .

# شاشەی پلازمـــا

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: سەروین عبدالله
سەرچاوە موقع کتاب العربی

ئەم جۆرە شاشانە توانا هەر یەك خاڵ Pixel توانای هەڵگیرساندنت تەنیایی هەیە بە شێوەیەك هەر وەك گلوپی نیونی ناو ماڵەکانمان ئەویش کە بە جۆریك لە غازە هەلدە گیرسێت .

ئەم جۆرە تەکنەلوجیایە هەڵ دەستێت بە دروست کردنی گڵوپی وەردی زۆر بە توانا لە غازی فسفوری کەسك بۆ ئەوەی وێنەکە بەشێوەیەکی زۆر باش پێشان بدات وە ئەم جۆرە شاشانە توانا رووناکیان زۆر زیاترە لە شاشەکانی کریستاڵ .

ئەم جۆرە توانای وێنە وەرگرتنی وە وایە هەر وەك چۆن وێنە وەردەگرین بە ئەریەلی هەوایی وە هەروەها وەك وەرگرتنی وێنەی دیجتاڵ لەو ئامێرانە کە کاری پێ دەکرێت لە سەری .

وە چاکیەکەی لەمە دایە کەوا زۆر باریك و ڕاستە ( flat) بە شێوەیەك کە وێنەکە لە شوێنی خۆی زۆر باش دیار بێت .

وە هەندێك لە شاشەکانی پلازما پێوەرەکەی دەگاتە ١٠٠ بوصە ئەم قەبارەیە هیچ شاشەکی تر لە جۆرەکانی تر نەی گەیشتوونەتیٚ .

وە زۆربەی گرفتەکانی ئەم جۆرە شاشانە ئەمەیە کە وا یەك وێنە گەر زۆر بمێنێتەوە ئەبێتە هۆی کەمی ڕۆناکی لەم خاڵانەی کەوا لە وێنەکە دیار دەبێت.

بەڵام ئەم جۆرە کۆمپانیایانە هەڵ دەستن بە جوڵانی وێنە ڕاگیراوەکان بەشێوەیەکی زۆر ورد کە بینەر هەستی پێناکات بۆ ئەوەی توشی ئەم گرفتە نەبن وە کومپانیاکان دەڵێن تەمەنی ئەم شاشانە دەگاتە تەمەنی شاشە کانی تر .





# زاراوەکـــانی مۆبایـــل

## بەشی یەکەم

و/عەرەبی:دەریا حسێن
سەرچاوە: موقع كتاب العربي

مۆبایل وەکو کۆمپیوتەر خاوەنی کۆمەڵێك لە زاراوەو کۆمەڵێك لە وشەو کۆمەڵێك نهێنیە بۆیەش تێگەیشتنیان واتە تێگەیشتن لە بەشێك لە نهێنیەکانی مۆبایل و زیاتر شارەزا بوون لە مۆبایل . لەهەمان کاتدا باشتر و بەسوود تر بەکارهێنانی مۆبایلە . بۆ ئەم مەبەستەش ئێمە دەست دەکەین بە شیکردنەوەی کۆمەڵێك لە زاراوەکانی مۆبایل بۆ ئەوەی بتوانین خزمەتێك بە بەکارهێنەرانی مۆبایل بکەین لە ڕێگای گۆڤاری کۆمپیوتەر :

### ١ - Bluetooth

بریتیە لە یەکێك لە مواسەفاتە تازەکانی مۆبایل فەرمانی گەیاندنی پەیوەندی و زانیاریە لە نێوان مۆبایلەکان و لە نێوان کۆمپیوتەری گەورەو بچووك ( ئەم خزمەتگوزاریە بە هۆی تەقەنیەی ڕادیۆیی کار دەکات ) . وە دەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵێك لە مۆبایل و کۆمپیوتەر و هەر ئامێرێکی تری هەڵگری ئەم خزمەت گوزاریە بکات .

### ٢ - CMDA (Code Division Multiple Access

بریتیە لە پێوەرێك بۆ مۆبایل کە بەکاردێت لە یابان و هەندێ ناوچەی ڕۆژهەلات و ئەمەریکا وە ئەم کۆدە بۆ ئەوشوێنانە بەکاردێنێت کە بەشداربوانی ئەم هێڵە لەم شوێنانە شەبەکەیان نەمێنێت بەم کۆدە دەتوانن سوود لە لەرێی دوور وەربگرن و پەیوەندیان بەردەوام بێت .

### ٣- CLI (Calling Line Identification)

پێناس کردنی هێڵی پەیوەندی ، خزمەت گوزاریەکە بۆ چوونە ناو هێڵی پەیوەندی . بۆ نمونە ١١١ ئاسیا سێل یان ٢٢٠ کۆرەك تیلیکۆم . لەڕێگای ئەم خزمەت گوزاریەوە و بەشداربوان لەڕێگایەوە دەچینە ناو هێڵی پەیوەندی بۆ داواکردنی یارمەتی یان وەڵام دانەوەی پرسیارەکانیان .

### ٤- Coverage

مانای تەواوی ئەوشوێنانەی کە مۆبایل دەتوانێت پەیوەندیەکان ببەستێت یان وەریگرێت وە ئەم زاراوایە ئەندازیارانی بواری مۆبایل بەکاری دێنن بە ڕێژەی سەدی بۆ شوێنەکانی وەرگرتن و ناردنی پەیوەندی لەسەر ئاستی ژمارەی بەکارهێنەران بەلاَم بونی شەبەکە بەشێوەی جوگرافی ئەوا زاراوەیەکی تری هەیە

### ٥- Dual Band

واتە شەپۆلی دووانی وە ئێستا زۆربەی مۆبایلەکان شەپۆلی دووانین چونکە دەتوانرێت بگۆرێت بۆ لەرەی GSM1800بۆ GSM900وە زۆربەی مۆبایلەکان سود لەم شەپۆلە دوانیەی وەردەگرن وە زۆربەشیان MHZ١٨٠٠ بەکاردێنن ئەمەش بۆ زیاتر وەرگرتن و زیاتر بونی بەشداربوانیان وە فراوانکردنی شەبەکەیان چونکە مۆبایلی ٩٠٠ MHZ هەیە هەندێك کۆمپانیای تایبەت دەتوانن لەرەیان لە ٩٠٠ بگۆرن بۆ ١٩٠٠ بۆ ئەوەی ئەگەر گەشتیاران چونە وڵاتێکی تر بتوانن مۆبایلەکانیان بەکاربێنن .

### Dual Mode - ٦

واتا مۆبایلەکە ئامادەیە بۆ بەکارهێنانی بە دوو ڕێگای جیاواز ئەم سیستەمە لە ئەمریکا هەیە واتا تۆ دەتەوێت بـە سیـستەمی ڕەقـەمی دیجیتـاڵی کـار بکـەیت یـان بەسیستەمی ئاسایی ئەنەلۆگ وە ئێستا مۆبایلی تر هەن بە هەردوو حاڵەت کاردەکات کە بەنەوی سێیەم ناسراوە.

### EMS (Enhanced Messages System) -٧

بریتیە لـە خزمـەت گـوزاری نـاردنی نامـە وە جیـاوازە لـە ناردنی کورتە نامەیەکی ئاسایی چونکە دەتوانێت وێنە بەیانیەکان و ئاوازو گۆرانی بگوازێتەوە لە مۆبایلیکەوە بۆ مۆبایلێکی تر جگە لەناردنی کورتە نامەو تێکست .

### GPS -٨

سیستەمی جیهانی بۆ دەست نیشانکردنی شوێن بەهۆی سیستەمی ڕادیۆیی لاسلکی کە بۆ زانیاریەکانی پشت بە مانگـە دەسـتکردەکان دەبەسـتێت وە بەکارهێنـەران و بەشداربووانی مۆبایل بـۆ دەست نیشانکردنی شوێنی خۆیان لە گۆی زەوی سودی لێوەردەگرن .



**تێبینی : هەر بابەتێك بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .**

- هەر بابەتێك لە شوێنێك یان لە گۆڤارێکی تری کوردی بڵاو کـرابێـتـەوە ئـێـمـە بـڵاوی ناکەینەوە .
- ئەگەر بابەتەکان ئەشیا بۆ بڵاو کردنەوە ئەوا بابەتەکە ناگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەنەکەی .
- هەر کەسێك بابەت ئەنێری بۆ بڵاو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بە تەواوی باسی بابەتـەکـە ڕوون بکاتەوە وبە بەرنامەی Microsoft Wordبابەتەکە بنووسرێت و وێـنـەکـانـی ڕوونکەرەوە لەگەڵ هەمان بابەت بنێرێت بۆمان بەڵام با وێنەکان لە نێو فۆڵدەرێکی جـیـاواز بێت و لەسەر سیدی یان لەسەر فلاش میمۆری بۆمان بنێرێت.